**پێشکەشە بە هاوڕێ و هاوژینم (*ئەوین سلێمان جیهان*) کە هەموو جوانییەکانی دنیام لە چاو و دڵی ئەودا دەبینم.**

**::::::::::::::::::::::::::::::::::::::::::::::::::::::::::::::::::::::::::::::::::::::::::::::**

## یەک

هێشتا خەمبار و ڕەشپۆشی دایکم بووین کە پایزی ڕابردوو مردبوو، سێ مانگەی زستان لەگەڵ کاتیا و سۆنیا لە گوند ماینەوە.
کاتیا دۆستی لە مێژینەی بنەماڵەکەمان بوو و هەر وەها ئاگاداریشی لێ دەکردین، من و خۆشکم لە بەر دەستی ئەودا گەورە بووبووین و من لەو کاتەوە کە وەبیرم دێ ئەوم لە ماڵی خۆماندا دیتبوو و خۆشم ویستبوو. سۆنیا خوشکی چکۆڵەم بوو. زستان لە ماڵە قەدیمییەکەی ئێمە، لە گوندی پۆکرۆڤسکۆڤیا[1]، زۆر تاڵ و دژوار و خەماوی بوو. هەواکەی سارد و تووش بوو و تەزووی سەرما کاری لە ئێسکی لەش دەکرد. باڕن و بادەوە گێژی دەدا و بەفری دێنا لەبەر پەنجەرەکەدا کۆی دەکردەوە. جاری وابوو بارستاییەکی هێندە زۆر بوو وەک دیوار بەر پەنجەرەکەی دەتەنی. شووشەکان هەمیشە لە دیوی ژوورەوە دەبوونە یەک پارچە سەهۆڵ و ژوورەکە تاریک دادەگەڕا. بە دەگمەن میوانێک ڕووی دەکردە ماڵمان و کەسانێکیش کە جار و بار دەهاتن هیچ خۆشی و شادییەکیان لەگەڵ خۆیان نەدەهێنا و ڕوخسار و ئاکاریان خەمی لێ دەباری. هەموو بە سرتە قسەیان دەکرد، دەتگوت دەترسن کەسێکی خەوتوو خەبەر بکەنەوە و تەنانەت زەردەیەک نەدەنیشتە سەر لێویان؛ هەناسەیان هەڵدەکێشا و زۆر جار کە چاویان لە من و بە تایبەت سۆنیای خوشکم دەکرد کە خەمبار و ڕەشپۆش بووین، دەستیان دەکرد بە گریان. ماڵەکەمان دەتگوت خەمخانەیە و تۆزی مەرگی لێ نیشتبوو. ترسی مەرگ و تەمی خەم ماڵەکەی ڕەش داگێڕا بوو. دەرگای ژوورەکەی دایکم داخرا بوو و ترسی خستبووە دڵمەوە و کاتێک بەلایدا تێدەپەڕیم و دەمویست بچمە ژوورەکەی خۆم بخەوم، وزەیەکی سەیر و ڕازاوی هانی دەدام کە چاوێک لەو ژوورە ساردوسڕ و تاریک و نووتەکە بکەم.

---

[1] pokrovskoe

تەمەنم حەڤدە ساڵ بوو و دایکم هەر ئەو ساڵەی مرد بڕیاری دابوو ماڵمان بچێتە شار و من بۆ کۆڕ و کۆبوونەوەکان پێم بکرێتەوە و لەگەڵ خەڵکی ئاشنا بم. مەرگی دایکم بۆ من ئاخێزگەی خەمێکی گەورە بوو. بەڵام دەبێ ددانی پێدا بنێم کە لە پشت ئەو خەمەوە هەستێکی تریش هەبوو، ئەویش ئەوە بوو گەنج بووم و وەک خەڵک دەیانگوت شۆخ و نازدار، ئەوەش دووهەمین زستان بوو کە تەمەنم لەو گوندە و بەو شێوەیە بە زایە دەچوو. لە کۆتاییی زستاندا ئەو هەستی خەمۆکی و خەفەت و تەنیاییە بە جێیەک گەیشت کە لە ژوورەکەم نەدەهاتمە دەرێ و دەرگای پیانۆکەم دادەدایەوە و دەستم بۆ کتێب خوێندنەوەش نەدەچوو. کاتێک کاتیا هەوڵی دەدا پێملم بکات کە خۆم بە شتێکەوە سەرقاڵ بکەم و واز لەو تەنیایی و خەمۆکییە بێنم، لە وڵامیدا دەمگوت: «تاقەتم نییە. ناتوانم!» لە دڵی خۆشمدا دەمگوت: «کاری چی، کاتێک باشترین ساڵانی ژیانم بەو شێوە بە فیڕۆ دەچێ ئیتر کار بەکەڵکی چی دێ؟ خۆم سەرقاڵ بکەم؟ بۆچی؟» ئەم"بۆ چییەش؟" تەنیا وڵامێکی بوو، ئەویش فرمێسک بوو کە بە چاومدا دەهاتە خوارێ.

دەیانگوت لاواز بووم و جوانی و گەشە و نەشەم نەماوە، بەڵام من گویم بەو شتانەش نەدەبزوا. "بۆچی؟ بۆ کێ؟" پێموا بوو تەواوی ژیانم دەبێ لە قوژبنی تەنیا و دوورە پەرێزیی ئەم کوێرەدێیە و خەم و پەژارەی ناچاریدا بە فیڕۆ بچێت و من بە تەنیایی نە دەمدەتوانی خۆم لە تەڵەی ئەو دوورەپەرێزی و خەفەتە دەرباز بکەم و نە حەزیشم دەکرد لێی ڕزگار بم. لە ئاخر و ئۆخری زستاندا وردەوردە کاتیا سەبارەت بەو خەمۆکی و دوورەپەرێزییەی من تووشی دڵنگەرانی بوو و بڕیاری دا هەرچۆنێک بێ دەبێ سەفەرێکی هەندەران بکەین. بەڵام سەفەری هەندەران بە دەستی بەتاڵ نەدەگونجا و ئێمەش دەکرێ بڵێین دوای مەرگی دایکم وەها سەرمان لێشێوا بوو نەماندەزانی چیمان هەیە و بەڕێچوونمان چۆنە، هەمیشە چاوەڕوانی قەویت و سەرپەرشتیارێک بووین بێت و بەشەماڵ و سامانەکەمان بۆ ڕوون بکاتەوە.

لە مانگی مارسدا قەویت هات.

ڕۆژێک کەمن خەمبار و بیر ئاڵۆز، بەبێ ئەوەی هیچ ئامانجێکم هەبێ و حەزم لە کاربێ، گێژوویژ وەکوو نیسێ بە نێو ژوورەکەمدا دەخولامەوە و خۆشم

نەمدەزانی بۆ ئاراوقارام لێ هەڵگیراوە، کاتیا خۆی کرد بە ژووریدا و گوتی: «باشە، شوکور بۆ خودا سێرگی میخائیلۆڤیچ[٢] هاتووە بۆ گوندەکەمان و کەسێکی ناردووە کە لە حاڵوباڵمان بپرسێ، گوتووشیەتی بۆ نیوەڕۆ دێ بۆ ئێرە.» پاشان گوتیشی: «ماشچکا[٣]، خۆشەویستەکەم، وەرەوە سەرخۆ، ئاوا نابێ. ئاخەر ئەو چۆن دەبێ ئاوا بتبینێ؟ ئەو تۆش و ئێمەشی زۆر خۆش دەوێ.»

ئەم سێرگی میخائیلیچە نزیکترین دۆستی ئێمە و هاوڕێی نزیکی باوکی خوالێخۆشبووم بوو، بەڵام زۆر لە باوکم جحێڵتر بوو. جگە لەوەی هاتنی ئەو هەموو پلانەکانی ئێمەی دەگۆڕی و ئەو هەلەی بۆ دەڕەخساندین کە لەو گوندە دوورەدەستە کۆچ بکەین، من لە منداڵییەوە خۆشم دەویست و ڕێزێکی زۆرم بۆ دادەنا، کاتیاش کە داوای لێکردم بێمەوە سەرخۆ و هەروەک دەیگوت ئاوا نابێ، دەیزانی کە سێرگی میخائیلیچ لە نێو هەموو خزم و ئاشنایاندا کەسێکە کەمن بە هیچ شێوەیەک حەزناکەم لەبەر چاوی کزۆڵە و ناحەز دیار بم. جگە لەوە من وەک هەموو ئەندامانی بنەماڵە، لە کاتیا و سۆنیاوە (کە کردبووی بە کچی خۆی) بگرە هەتا دەگاتە کاشەوانە ئاساییەکەمان، هەمووومان بە پێی خووخدە خۆشمان دەویست، ئەو بە لای منەوە گرینگایەتییەکی تایبەتی هەبوو و بە چاوێکی تر سەیرم دەکرد، ئەویش بەو هۆیە بوو کە دایکم ڕۆژێک هەر لەلای خۆی پێی گوتبووم کە ئاواتم ئەوەیە مێردێکی وەک ئەوت هەبێ. ئەو قسەیەی دایکم لەو کاتەدا بۆ من زۆر سەیر و تەنانەت ناخۆشیش بوو. چونکە ئەو مێردەی لە خولیاکانمدا دەژیا و بیرم لێ دەکردەوە قەڵافەتێکی بە تەواوی جیاواز لە سێرگی میخائیلۆڤیچی هەبوو. کەسایەتیی نێو خولیاکانی من لاوێکی بەلەباریکەی خەمبار و ڕەنگ پەڕیو بوو. بەڵام سێرگی میخائیلیچ لە لایەکەوە ئیتر گەنج نەبوو و زۆرکەڵەگەت و قەویوقۆڵ و هەتا ئەو جێیەی لە زەینمدا بوو هەمیشە دەم بە پێکەنین و کەیف ساز بوو. بەڵام سەرەڕای ئەوەش وتەکەی دایکم لەسەر لاپەڕەی خەیاڵم نەخشی بەستبوو و لە شەش ساڵ لەمەوبەرەوە کە ئەو کاتە یازدە ساڵم تەمەن بوو، ئەو لەگەڵ من وەک منداڵێک دەدوا و زۆر خۆمانە یاریی

---

٢- لەم چیرۆکەدا ناوی ئەو کەسایەتییە هێندێ جار سێرگی میخائیلۆڤیچ و هێندێ جاریش سێرگی میخائیلیچ هاتووە کە دووهەمیان خۆمانەترە.

٣- ماشچکا و ماشنکا هەردووکیان سووکەڵە ناوی «ماشا»ن کە ئەویش سوکەڵە ناوی مارىيایە.

لەگەڵ دەکردم و پێی دەگوتم «خاتوو وەنەوشە»، هێندێ جار لە دڵی خۆمدا دەمگوت جا ئەگەر بڕیار بدات و بمخوازێ، چبکەم؟ کە بیرم لەوە دەکردەوە ترسێک سەرتاپای دادەگرتم.

سێرگی میخائیلیچ بەر لە فراوێن هات بۆ ماڵمان. کاتیا بۆ نیوەڕۆ سفرەکەی بە پیراشکی و کرێم و سۆسی ئەسپەناخ ڕازاندبۆوە. من لە پەنجەرەکەوە چاوم لێبوو بە سواری کاشە چکۆڵانەکەی خۆی بەرەو لای ماڵی ئێمە دەهات. بەڵام هەرکە سەری ئەسپەکەی وەرسووڕاند و بەرەو ڕێگای بەر ماڵەکەی ئێمە بایدایەوە، من بە هەڵەداوان چووم بۆ ژووری میوانداری، چونکە دەمویست وا بنوێنم کە بە هیچ شێوەیەک چاوەڕوانی هاتنی ئەو نەبووم. بەڵام کاتێک ترپەی هەنگاوی و قسە کردنەکەیم لە پێشخانەکە بیست و تەقەتەقی کەوشەکانی کاتیا کە دەچوو بەرەوپیری، خۆم پێ ڕانەگیرا و خۆشم چووم بەرەوپیری. ئەو دەستی کاتیای لە دەستی گرتبوو و بەدەنگی بەرز قسەی دەکرد. کەچاوی بە من کەوت لەناکاو بێدەنگ بوو و ماوەیەک چاوی تێبڕیم. نە سەری دانەواند و نە سڵاو و چاک و خۆشیی لەگەڵ کردم. من هێندێک شڵەژام و هەستم کرد ئەویش تۆزێ سوور هەڵگەڕا.

پاشان بە لەبزێکی لێبڕاوانە و شێوەیەکی تایبەت بە خۆی هەر دوو دەستی لێک ئاوەڵا کرد و هات بۆ لام و گوتی: «ئێ، ئەوە تۆی؟ چەندەش گۆڕاوی! شوکور بوویەتە گەورە کچ! هەر دەڵێی دوێنێ بوو «خاتوو وەنەوشە»ی من بووی. ئێستا ئیتر وەنەوشەی چی و شتی چی؟ بوویەتە تۆپێک گوڵاڵە سوورە!»

بە دەستە زلەکانی دەستی گرتم و هێندەی بە گەرمی گوشی کە بەڕاستی ئێشم پێگەیشت. لە دڵی خۆمدا گوتم حەتمەن ئێستا دەستیشم ماچ دەکا. خەریک بوو خۆم بکێشمە دواوە و نەهێڵم بەڵام ئەو جارێکی تر دەستی گوشیم و چاوی زیت و پڕ نەشەی لە چاوانم بڕی.

شەش ساڵ بوو چاوم پێی نەکەوتبوو. زۆر گۆڕا بوو. بە تەمەنتر بووبوو و دەموچاوی ڕەشکەڵە و لەسەر هەر دوو لاجانگی ڕیشی هێشتبۆوە و دەتگوت لینگە جزمەن و لە ڕوخساری نەدەکاڵایەوە، بەڵام وەک ساڵان ڕووخۆش و دەم بە پێکەنین نەبوو و هەڵسوکەوتیشی سادە و سادقانە نەبوو. دەموچاوی پان و

چاوەکانی بە تروسکەی ئاوەزمەندی دەدرەوشایەوە، مێهرەبان بوو و ئاکارێکی سادە و منداڵانەی هەبوو.

پێنج خولەک تێ نەپەڕیبوو کە ئیتر میوانی تازە هاتوو نەبوو، بەڵکوو بۆ هەموان خۆمانە بوو. تەنانەت بۆ خزمەتکارەکانیش کە بەهۆی خۆشخزمەتییەوە دیار بوو بە هاتنی دڵخۆشن.

هەڵسوکەوتی ئەو وەک هی ئەو جیرانانە نەبوو کە دوای مردنی دایکم دەهاتن بۆ ماڵمان و بە پێویستیان دەزانی ماوەیەک لە لامان دانیشن و بە بێدەنگی فرمێسک هەڵوەرێنن. بە پێچەوانەوە ئەو خۆی لە هیچ وتەیەک نەدەبوارد و شاد و بەنەشە، تەنانەت یەک وشەش باسی دایە گیانمی نەکرد، بە جۆرێک کە ئەو خەمساردییە لە لایەن کەسێکی وەک ئەو نزیک و خۆمانەوە، سەیر و تەنانەت ناخۆشیش بوو، بەڵام دواتر بۆم دەرکەوت ئەو ڕەفتارەی ئەو بە هۆی خەمساردییەوە نییە بەڵکوو بە هۆی خۆشەویستییەکی ڕەسەنەوەیە، بۆیە ڕێزی ئەوم لەبەر بوو.

کە ئێوارە بەسەر داهات کاتیا چوو لەبەر سەماوەرەکەدا دانیشت، ئەو شوێنەی کە پێشتر ئەو کاتەی دایکم زیندوو بوو لێی دادەنیشت. من و سۆنیاش لە تەنیشتی دانیشتین و گریگۆری خزمەتکارە پیرەکەمان قەننە کۆنەکەی باوکی خوالێخۆشبوومی دۆزییەوە و هێنای بۆ سێرگی میخائیلیچ و ئەو بە پێی خدەی هەمیشەی خۆی هەستا و بە دەم دووکەڵ کردنەوە لە نێو ژوورەکەدا دەستی کرد بە هاتوچۆ.

ڕاوەستا و گوتی: «کە بیری لێ دەکەیەوە ئەم ماڵە ئیتر هیچ کوێی لە ڕابردوو ناچێ!»

کاتیا سەری سەماوەرەکەی نایەوە و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و لەگەڵ ئەوەی چاوی لە سێرگی میخائیلیچ بڕیبوو گوتی: «بەڵێ!» زۆریشی نەمابوو فرمێسک بە چاویدا بێتە خوارێ.

ڕووی لە من کرد و گوتی: «تۆ پێموایە باوکت لە بیر بێ!»

من گوتم: «زۆر کەم!»

لەگەڵ ئەوەی چاوی لە من بوو، چاوی لە شوێنێکی تۆزێ بەرزتر لە چاوانم بڕی و خەیاڵ هەڵیگرت، دوای تاوێک لەسەر خۆ گوتی: «ئەگەر ئەو بمابایە، ئێستا لەگەڵ ئەو زۆر سەر و دڵخۆش دەبوون!» پاشان هێواشتر گوتیشی: «من زۆرم باوکت خۆش دەویست!» لەگەڵ ئەو قسەیەدا هەستم کرد چاوانی بە بریقەیەکی زیاتر درەوشایەوە.

کاتیا گوتی: «خودا ئەوە دایکیشی لێ سەندینەوە.» هەر خێراش سەرچادانی نایە سەر چادانەکە و دەستە سڕەکەی خۆی هەڵگرت و دەستی کرد بە گریان.

سێرگی میخائیلیچ سەری وەرسووڕاند و دووپاتی کردەوە: «بەڵێ، هەموو شتێک لەمماڵەدا گۆڕاوە! زۆر گۆڕاوە!» پاشان دوای ماوەیەک بێدەنگی گوتی: «سۆنیا، لەیستۆکەکانت بێنە بزانم!» خۆشی ڕۆیشت بۆ ژوورێکی تر.

کاتێک ئەو چووە دەرێ بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە لە کاتیام ڕوانی.

گوتی: «چ دۆستێکی مێهرەبانە!» بە ڕاستیش ئەو هاودڵییەی پیاوێکی غەریبە و مێهرەبان بۆ من زۆر وزەبەخش و دڵخۆشکەر بوو.

لە ژووری میوانداریيەوە دەنگی قیژە و قریشکەی شاد و منداڵانەی سۆنیا و هەوڵی سیرگی میخائیلیچ کە یاریی لەگەڵ دەکرد دەهاتە گوێ. من چاییم بۆ نارد و گوێم لێبوو لە پشت پیانۆکە دانیشت و سۆنیای لەسەر کۆشی دانا و بە دەستە چکۆڵەکانی ئەو پیانۆی دەژەنی.

گوێم لە دەنگی بوو کە لەو ژوورەوە دەیگوت: «ماریا ئەلکساندۆڤنا، وەرە بۆ ئێرە هێندێکمان پیانۆ بۆ لێدە.»

من زۆرم پێخۆش بوو کە ئەو ئاوا سادە و دۆستانە دەستووری پێدام چبکەم. هەستام و چووم بۆ لای.

دەفتەرێکی نۆتەی کردەوە و بەشی ئاداجۆی سۆناتی quasi una fantasia بێتهۆڤێنی لەبەر دەمم دانا و گوتی: «وەرە، ئەوە لێدە!» پەرداخی چایی بە دەستەوە گرت و لەگەڵ ئەوەی دەچوو بۆ ئەو سەری ژوورەکە، گوتیشی: «دەمەوێ بزانم چۆنی لێدەدەی!»

نازانم بۆ هەستم دەکرد ناتوانم بڕوبیانوو بێنمەوە. لە ڕووشم هەڵنەدەهات بڵێم دەستم ڕەقاس نەبووە. فەرمانی سێرگی میخائیلۆڤیچم لە گوێ گرت، لە پشت

پیانۆکە دانیشتم و دەستم کرد بە ژەنین، ئەو پەڕی هەوڵم دەدا چاکی بژەنم. زۆریش دڵگرانی داوەریی قازییەکەم بووم، چونکە دەمزانی لە مۆسیقا تێدەگات و حەزی لێیەتی. ئاداجۆ لەگەڵ هەستم سازگار بوو و کاتی وەبیرهێنانەوەی بیرەوەریی کۆن و وتوویژی جەنگەی چایی خواردن، خراپم نەژەنی. بەڵام ئەو نەیهێشت بەشی سکێرتزۆ[٤] بژەنم و هاتە ژوور سەرم، گوتی: «نا، ناتوانی ئەوە بە باشی بژەنی. بەڵام ئەوەی یەکەم خراپ نەبوو. دیارە زۆر باش هەستت لەگەڵ مۆسیقا سازگارە.» ئەو هاندانە جیددی و نیوە گەرمەی ئەوم هێندە بە دڵ بوو کە لە خۆشیانا سوور هەڵگەڕام. بۆمن زۆر شتێکی تازە و زۆریش خۆش بوو کە ئەو، هاوڕێ و هاوشانی باوکم، بەرەوڕوو و بەبێ ئەوەی کەسێکی تری لێ بێ، لەگەڵ من، وەک ئەوەی لەگەڵ هاوتەراز و هاوڕێیەکی خۆی قسە بکات، بە شێوەیەکی جیددی دەدوا و قسەکردنی ئێستای وەک ئەو کاتە نەبوو کە منداڵ بووم. کاتیا چووبووە قاتی سەرێ سۆنیا بخەوێنێ و من و سێرگی میخائیلۆڤیچ پێکەوە تەنیا کەوتبووین.

ئەو باسی باوکمی دەکرد و چۆنییەتی یەکتر ناسینیان و ئەو کاتەی کە من هێشتا سەرقاڵی دەرس و مەشق و بووکۆکە و لەیستۆک بووم ئەوان پێکەوە چ ژیانێکی خۆشیان بووە و لە ناوەرۆکی باسەکانی ئەودا دەرکەوت باوکم پیاوێکی هێمن و لەسەرەخۆ و بەنەشە بووە و ئەوەش زۆر بە لامەوە تازە بوو. ئەو زۆری پرسیار لێدەکردم سەبارەت بە حەز و ئاواتەکانم و ئەو کتێبانەی دەیخوێنمەوە و چ بەرنامەیەکم بۆ داهاتووم هەیە و لە هەموو بارێکەوە ڕاوێژی لەگەڵ دەکردم و بە ڕێنوێنییەکانی ڕچەی ژیانێکی نوێی بۆ دەشکاندم. ئەو بۆ من ئێستا ئەو پیاوە جەفەنگ باز و قسەخۆشەی پێشوو نەبوو کە سەری دەخستە سەرم و کەرەسەی یاریی بۆ درووست دەکردم، بەڵکوو پیاوێکی جیددی و دڵساف و نەرمونیان بوو، کە من بەبێ ئیختیار ڕێزم بۆ دادەنا و خۆشم دەویست. زۆر بە ڕاحەتی و بە چێژەوە قسەم لەگەڵ دەکرد. سەرەڕای ئەوەش دڵەخورپەیەکی نەخوازراو دایگرتبووم و شتێک لە سەر دڵم قورسایی دەکرد. هەر وشەیەک لە زارم دەهاتە

[٤] schertzo

دەرێ تا ڕادەیەک نیگەرانی دەکردم و دەترسام شایانی خۆشەویستیی ئەو نەبم، چونکە من کچی پیاوێک بووم کە دۆست و هاوڕێی گیانی گیانیی ئەو بوو.

کاتیا دوای ئەوەی سۆنیای خەواند هات بۆ لامان و دەستی کرد بە سکاڵا و گلەیی لێم و ئەوەی کە خەمۆک و دوورەپەرێزم و سەبارەت بە هەموو شتێک خەمساردم؛ ئەگەرچی لەو ماوەیەدا کە دووبەدوو بووین من لەو بارەوە یەک وشەم بۆ میوانەکەم نەدرکاندبوو.

سێرگی میخائیلیچ بزەیەکی هاتێ و بە نیشانەی لۆمە کردن سەرێکی ڕاوەشاند و گوتی: «ئەو، ئەوەی لە هەموو شتێک گرینگترە لێی شاردومەتەوە!»

گوتم: ئەو قسانە شیاوی باس کردن نین و تەنیا بێ تاقەتی دەکردن. ئەوەش خۆ گرینگ نییە، تێپەڕ دەبێ.»(هەر بە ڕاستیش دەتگوت تێپەڕ دەبێ، چونکە هەر لەو کاتەدا تەمی خەم و دڵتەنگی لەسەرم ڕەویبۆوە و دەتگوت قەتم کەسەر و پەژارە نەبووە.)

گوتی: «بێزاری و دوورەپەرێزی شتێکی باش نییە. یانی تۆ پێت وایە کچێکی نازدار و تاقانەی؟»

من بە پێکەنینەوە وەڵامم دایەوە: «جا دیارە تاقانەم!»

ـ «نا، کچێکی تاقانە کە تەنیا بە تاریف و پیاهەڵدانی خەڵکی دڵخۆشە و لەگەڵ تەنیا کەوتن ئەژنۆی خەم لە باوەش دەگرێ و لە هەموو شتێک بێزار دەبێ، هیچ باش نییە و ناکەوێتە بەر دڵم. ئەوە نیشانەی خۆنواندنە و دیارە هیچ بایەخێک بۆخۆت دانانێی! وایە؟»

بۆ ئەوەی بێدەنگ نەبم و شتێک بڵێم، گوتم: «زۆر سپاس ئەو قسانەتان بۆ من وەک شەکر شیرینن!»

تۆزێ بێدەنگ بوو پاشان گوتی: «کە وایە تۆ چ شێوەیەکت چۆتەوە سەر باوکت؟ تۆ بە ڕاستی...» سەرنجی پڕ لە خۆشەویستی و هیوا پێدەرانەی جۆرێک بوو کە بووە هۆی شادی و شەرمەزاریم.

هەر لەو کاتەدا و لە ڕوخسارە شاد و پڕ بزەکەیدا ترووسکەی نیگایەکم چاو پێکەوت کە تایبەتی خۆی بوو، سەرەتا ڕووناک بوو پاشان وردەوردە قووڵ و زیت و ڕازاوی و تەمێکی تەنکی خەمی لە خۆگرت.

گوتی: «ئێوە نابێ دڵتان بکەنە هێلانەی خەم و کەسەر. هیچ هۆکارێکیش نییە کە هەست بە پەژارە و وەڕەزی بکەن. لەخۆڕا خۆتان تووشی دڵتەنگی و داهێزران مەکەن. دەتوانی مۆسیقا بژەنی بە جۆرێک کە لە ناخەوە هەستی پێدەکەی، کتێبت هەیە و متاڵا دەکەی، تازە هەوەڵی دەمتە و سەرەتای ژیانتە، ئێستا کاتی ئەوەیە خۆتی بۆ ئامادە بکەی و پاشان ئاخی بۆ هەڵنەکێشی. هەتا زووە دەبێ لە بیری خۆتدا بێ چونکە ساڵێکی تر درەنگ دەبێ.»

ئەو وەک باوک یان مامێک قسەی لەگەڵ دەکردم و هەستم دەکرد کە دایم چاوی بە سەرمەوەیە و خۆی دێنێتە ڕیزەی من. دڵتەنگ دەبووم کە دەمدی لەگەڵ ئەو هاوشان نیم و لەگەڵ ئەوەشدا بەوە دڵخۆش بووم کە لەبەر من هەوڵ دەدا ئەوە نەبێ کە هەیە.

شەوێ تا درەنگانێ لەگەڵ کاتیا سەبارەت بە کاروباری ماڵێ و بارودۆخی مڵکەکەمان قسەیان دەکرد.

پاشان هەستا و هات بۆ لای من، دەستی گرتم و گوتی: «دەی، دۆستانی خۆشەویست، خوداحافیز!»

کاتیا لێی پرسی: «خوداتان لەگەڵ، کەنگی بە خزمەتتان دەگەینەوە؟»

هەروا کە دەستی منی گرتبوو وەڵامی دایەوە: «کۆتایی بەهار. من ئێستا دەچم بۆ دانیلۆڤکا[٥](دانیلۆڤکا گوندەکەی دیکەی ئێمە بوو.) دەبێ بەکارەکانی ئەوەێ ڕابگەم و بزانم بارودۆخەکە چۆنە و ئەوەی پێویستە جێبەجێی بکەم، پاشان سەرێک لە مۆسکۆ دەدەم و لەوێ بە کارەکانی خۆم ڕادەگەم. وەڵحاسڵ کۆتایی بەهاریش نەگەڕێمەوە هاوینێ دەگەڕێمەوە.»

من بەخەم و دڵەدواییەوە گوتم: «جا بۆچی ئاوا درەنگ؟ یانی ناچاری ماوەیەکی ئاوا زۆر لێرە دووربی؟» هەر بە ڕاستیش پڕ بە دڵ هیوادار بووم هەموو ڕۆژێ چاوم پێی بکەوێ و لە ناکاو دڵم پڕ بوو و ترسام دیسان خەم و خەفەت باڵم بەسەردا بکێشێتەوە و ئەو تێکچوونە لە ڕواڵەت و نیگا و ئاخافتنمدا ڕەنگی دایەوە.

---

[٥] Danilovka

ئەو بە لەبزێکی وەها کە لە گوێمدا زۆر سارد و سڕ بوو گوتی: «بەڵێ، خۆتان زیاتر سەرقاڵ بکەن و هەوڵ بدەن نەهێڵن دڵتەنگی و خەمۆکی بەسەرتاندا زاڵ بێت.» دوای ئەوەی دەستی بەردام، بێ ئەوەی ئیتر چاوم لێ بکات گوتیشی: «کاتێک گەڕامەوە تاقیتان دەکەمەوە.»

لە پێشخانەکە ڕاوەستا بووین و بەڕێمان دەکرد. ئەو بە پەلە باڵتەکەی لەبەر کرد وهەوڵی دەدا چاوم لێ نەکات. لە دڵی خۆمدا گوتم: «بۆ ئەوەندە زەحمەت دەخاتە بەر خۆی. بیر لە چی دەکاتەوە؟ یانی بە ڕاستی پێی وایە بۆی دڵتەنگ و بێ تاقەت دەبم؟ هەڵبەت زۆر پیاوێکی باشە، زۆریش باش... بەڵام ئیتر نابێ زێدەڕەوی لە تاریفاتیدا بکەم.»

سەرەڕای ئەوەش من و کاتیا ئەو شەوە ماوەیەکی زۆر لە نێو پێخەفەکەدا بەخەبەرماینەوە و قسەمان دەکرد. نەک ئەوەی باسی ئەو بکەین. بۆ هاوینی داهاتوو گەڵاڵەمان دادەڕشت و تەگبیرمان دەکرد زستان لەکوێ ڕابوێرین و چبکەین. ئەو پرسیارە ترسناکە «ئەی چی؟» ئیتر لەبەرەممدا قوت نەدەبۆوە. مەسەلەکە لەبەر چاوم ڕووناک و سادە بوو. ژیان دەبوو بە خۆشی تێپەڕێ و داهاتوو بۆ من لێوڕێژ بێ لە بەختەوەری. وەک ئەوە وابوو کە ماڵەکەمان لە پۆکرۆڤسکۆڤیا ژیانی تێزابێتەوە و کەلاوڕێژ بێ لە شادی و خۆشی.

## دوو

بەهار هات. تەمی خەم و خەفەتی ڕابردوو لە سەرم ڕەویبۆوە و هەستێکی خۆش وەک خەونێکی شیرینی گەشانەوە کە تایبەتی بەهارە، لەگەڵ ئاوات و هیوای نادیار جێگای گرتەوە. ژیانم لەگەڵ سەرەتای زستان هیچ وێکچوونێکی نەبوو. خۆم بە سۆنیاوە سەرقاڵ دەکرد و کتێبم دەخوێندەوە و پیانۆم دەژەنی. زۆر چوومە نێو باخ و باخاتەکە و بەتایبەت شەوانە ماوەیەکی زۆر بە ڕاستی زۆر، لە باریکە ڕێگاکانی باخەکەدا پیاسەم دەکرد یان لەسەر کورسییەک دادەنیشتم و خودا دەزانێ چەندە فیکر و خەیاڵ لە مێشکمدا وەک هەنگەژاڵە دەهارووژان و

ئاوات و هیواکان تووشی دڵەخورپە و بێ تاقەتییان دەکردم. هێندێ جار شەوانە هەتا بەیانی، بە تایبەت شەوانی مانگەشەو لەبەر پەنجەرەی ژوورەکەم دادەنیشتم و برێ جار تەنانەت بە توێی کراسێک و بەدزییەوە و دوور لە چاوی کاتیا دەچووم بۆ نێو باخەکە و بە سەر هەردی تەڕ و پڕئاونگ و خوناوەدا هەتا لای هەسێڵەکە هەڵدەهاتم. جارێکیان تەنانەت چووم بۆ مەزراکە و بەو شەوە و بە تاقی تەنیا بە دەوری باخەکەدا سووڕامەوە.

ئەمڕۆ بە ڕاستی دژوارە بۆم کە وەبیرم بێتەوە چ خەون و خولیایەک خەیاڵی داگرتبووم. تەنانەت ئەگەر وەبیریشم بێتەوە باوەڕ ناکەم کە ئەو خولیا و خەیاڵانە مێشکی منیان بە خۆیانەوە خەریک کردبێ، چونکە بە ڕاستی زۆر سەیر و لە ژیان بە دوور بوون.

سێرگی میخائیلۆڤیچ هەر وەک بەڵێنی دابوو کۆتایی مانگی مەی لە سەفەر گەڕایەوە.

جاری یەکەم شەوێ و بە بێ هەواڵ هات بە جۆرێک کە ئێمە نە بیرمان لێ دەکردەوە و نە چاوەڕوانی بووین. لەبەر ساباتەکە دانیشتبووین و خەریکی چایی خواردنەوە بووین. باخەکە هەموو سەوزەڵانی بوو باخچەکان پڕ بوون لە گوڵ و ڕێحانە و چریکەی بولبول و شالوور ئیتر نەدەهاتە گوێ و لەوێ جێیان خۆش کردبوو و هەتا ڕۆژی پیۆتەری قەدیس[٦]. بنج و دەوەنی چروپڕ و تۆخی یاسی بنەوش دەتگوت تۆزێکی سپی و بنەوشیان لێ پڕژاوە. چرۆکان خەریک بوون دەپشکووتن. پەردەی چپڕی دارستانی غان کە خۆر لە پشتیانەوە ئاوا دەبوو بریقەی دەهات. ژێر ساباتەکە فێنک بوو. گیا و گژی نێو باخەکە نوقمی شەونم بوون و بۆنی گوڵ و سەوزەڵانی وڵاتی داگرتبوو. لەو دیوی پەرژینی باخەکەوە دەنگ و زایەڵەی کۆتایی ڕۆژ، لەوانە هۆهۆی شوان و زایەڵەی زەنگوڵەی ملی پێشەنگ تێکەڵ دەبوو کە خەریک بوون ڕانەکەیان بەرەو سەرگێڕ و ئاغەڵ ڕادەدا. تیکۆن کە لاوێکی گەلحۆ بوو بە عارەبانە بەرمیلەکەیەوە بە توولەڕێی بەردەمی ساباتەکەدا تێدەپەڕی و بە ئاوپاشەکەی ئاوی فێنکی لە باخچەی تازەتەکمیش

---

٦- ڕۆژی پیوتەری قەدیس بیست و نوێ ژوئەنە و هاوین دەست پێدەکا و بولبولەکان ئیتر ناخوێنن.

کراو و گڵەپۆکی دیراوی گوڵ و ڕێحانەکان دەپڕژاند و ڕەنگی خاکەکەی تۆخ دەکرد.

لەبەر ساباتەکە و لەسەر ڕوومێزییەکی سپی سەماوەرێک قوڵتەقوڵت دەکوڵا کە زگەزەردەکەی وەک خۆر دەدرەوشایەوە و پیاڵەی پڕ لە نقشک و دەوریی پڕ لە نانەچەورەی تورت و شیرینی لەپاڵیدا داندرابوون. کاتیا بە دەستە ناسک و خرپنەکانی پەرداخەکانی ئاو دەکێشا و من، دوای مەلە کردنی دەمەوئێوارە لە نێو هەسێڵەکەدا، حەسابوومەوە و نەمدەتوانی ماتڵ بم هەتا چاییەکە دەم دەکێشێ و نقشکی خەست و خۆڵم بە نانی تازەدا دەساوی و دەمخوارد. کراسێکی کەتانی بێ قۆڵم لەبەردا بوو و سەروقژی تەڕم بە لەچکەیەک پێچا بوو. کاتیا یەکەم کەس بوو کە ئەوی دی و گوتی:

-«ئا، سێرگی میخائیلیچ هەر ئێستا باسی تۆمان دەکرد.»

من هەستام بچم جلەکانم بگۆڕم. بەڵام ئەو نەیهێشت و چاوێکی لە سەروقژی پێچراوم کرد و بە پێکەنینەوە گوتی: «ئەو تەشریفاتەی بۆ چییە؟ خۆشیی لادێ لەو بێگەردی و ساکارییەی دایە. بۆ شەرم لە گریگۆری ناکەن؟ وەبزانن منیش گریگۆریم.» بەڵام لەو کاتەدا بۆم دەرکەوت ئەو قەت بە چاوی گریگۆری لێم ناڕوانێ و هەستم بە شەرمەزاری کرد.

گوتم: «خێرا دەگەڕێمەوە.»بەپەلە خۆم کرد بە ژووریدا.

ئەو بەدوای مندا دەنگی بەرز کردەوە: «ئاخر بۆ لە خۆڕا لە خۆتی تێک دەدەی؟ ئاوا زۆر جوانی و هیچ عەیبێکی نەبوو. ڕاست وەکوو گەورە کچێکی ساکاری گوندنشین!»

لە ژوورەکەم لەگەڵ ئەوەی بەپەلە خەریکی گۆڕینی جلەکانم بووم لە دڵی خۆمدا گوتم: «زۆر سەیر چاوم لێ دەکا. زۆر چاکە، شوکر بۆ خودا دیسان هاتەوە. ئێستا ئیتر ماڵەکەمان وەک ڕابردوو کڕوکپ نابێ و گەرمی و ڕووناکیی تێدەزێ.» لە ئاوێنەکەدا لە خۆم ڕوانی و بەهەڵەداوان بە پلیکانەکاندا داگەڕام و بێ ئەوەی بیشارمەوە کە پەلەم کردووە بە هەناسە برکێ خۆم گەیاندەوە ژێر ساباتەکە. لە پشت مێزەکە دانیشتبوو و لەگەڵ کاتیا باسی بارودۆخی ماڵ و ژیانی ئێمەیان دەکرد. کە چاوی پێم کەوت زەردەیەکی گرت و درێژەی بە قسەکانی دا. بە وتەی

ئەو بارودۆخی ماڵێمان زۆر باش بوو. ئێمە دەبوو ئەو هاوینە لە گوند بژیایەن و پایز لەبەر قوتابخانەی سۆنیا بچین بۆ پترزبۆرگ یان دەرەوەی وڵات.

کاتیا گوتی: «بریا ئێوەش لەگەڵمان بهاتبایەن. ئێمە بەبێ ئێوە، تەنیا و ناشارەزا، هیچمان پێ ناکرێ.

ئەو بە نیوە گاڵتە و نیوە جیددی گوتی: «من لە خودام دەویست لەگەڵ ئێوە دەوری دنیاش لێ بدەم.»

گوتم: «دەی باشە بۆ نەگەڕێین؟ با دەورێکی دنیا لێ بدەین!»

بزەیەکی هاتێ، سەری لەقاند و گوتی: «ئەی دایکم چی لێ بکەم؟ ئەو هەموو کارەی بەسەرمدا ڕژاون چی لێ بکەم؟ بەڵام جارێ ئەو مەسەلەیە زۆر گرینگ نییە. ئێوە پێم بڵێن ئەو ماوەیەتان چۆن ڕابوارد؟ خۆ ئیتر ئەژنۆی خەمتان لە باوەش نەگرتووە؟»

کاتێک پێم گوت لەو ماوەیەدا کە ئەو لێمان دوور بووە، کارم کردووە و خەمم لە دڵمدا ڕانەگرتووە و کاتیاش قسەکانی منی پشت ڕاست کردەوە، ئەو بە زمانی ئافەرینی پێ گوتم و بە نیگای لاواندمیەوە، وەک ئەوەی منداڵێک شایانی پاداش بێ و خەڵاتی بکەی. پێموا بوو باش وایە بەوردی و سادقانە و ئەوەی هەیە و نییە بۆی باس بکەم. هەم ئەو کارە باشانەی کردبووم و هەم ئەوانەش کە لەلای قەشە ددانم پێدا نابوون کە لەوانە بوو ببێتە هۆی ناڕەزایەتیی ئەو. شەوێ هەواکەی هێندە خۆش بوو کاتێک پیاڵە و پەرداخی چایی کۆکرایەوە ئێمە هەروا لە ژێر ساباتەکە دانیشتبووین و خەریکی باس و دەمەتەقێ بووین، واشمان قسە گەرم کردبوو هەر لە بیرمان نەبوو چ کاتێکی شەوە، هەتا شەو و بێدەنگی وڵاتی داگرت و گوندەکەمان لە گۆمی مەندی شەودا نوقم بوو. بۆن و بەرامەی گوڵ لە هەموو لایەکەوە دەهات و شەونم سینگی چیمەن و گژوگیای خووساندبوو. بولبولێک خوێندی و پاشان کە دەنگی ئێمەی بیست بێدەنگ بوو. ئاسمان دەتگوت سەرپۆشی بە ئەستێرە پووڵەکەڕێزی خوی هێناوەتە خوارێ و لەسەر سەرمان کردوویەتە چەتر.

شەو شەق بووبوو، بەڵام کاتێک تێگەیشتم شەوەزەنگ باڵی بەسەردا کێشاوین کە شەمشەمەکوێرەیەک بە نەرمی خۆی کرد بە ژێر هەیوانی ساباتەکەدا و بە

دەوری لەچکە سپییەکەی مندا باڵی لێدا و هەستم بە بای نەرم و فێنکی باڵی کرد. خۆم بە دیوارەکەوە نووساند و هێندەی نەمابوو بقیژێنم. بەڵام چەکچەکییەکە هەروا بە نەرمی و بێ فڕەی باڵی کە هاتەبن ساباتەکەوە هەرواش ڕۆیشتەوە دەرێ و لەنێو تاریک و ڕوونی باخەکەدا بزر بوو.

سێرگی میخائلوڤیچ لەگەڵ ئەوەی بابەتی باسەکەی دەگۆڕی گوتی: «ئای نازانی من چەندەم ئەم پۆکرۆڤسکۆڤیایەی ئێوە پێخۆشە! حەزم دەکرد تەواوی تەمەنم لەژێر ئەم هەیوان و ساباتەی ئێوەدا دانیشم.»

کاتیا گوتی: «دەی زۆر چاکە ئێمەش پێمان خۆشە. ماڵی خۆتە!»

-«بەڵێ، گوتنەکەی ئاسانە. من دادەنیشم، بەڵام خۆ ژیان دانانیشێ...!»

کاتیا گوتی: «بۆ ژن ناهێنی؟ ئێوە بۆ هاوسەرەکەتان مێردێکی زۆر باش دەبن.»

ئەو پێکەنی و گوتی: «چونکە حەز دەکەم هەمیشە دانیشم؟ نا، کاترینا کارلۆڤنا[٧]. من و تۆ ئیتر کاتی ژن هێنان و شوو کردنمان بەسەر چووە. لە مێژە ئیتر هیچ کەس بە چاوی زاوایەتی یان بوخچەی نەکراوە چاومان لێ ناکا و خۆشم لە هەمووان کەمتر خۆم بە شیاوی زاوایەتی دەزانم. ماوەیەکی زۆرە ئیتر خەیاڵی ژن هێنانم لە سەرم دەرکردووە و بۆم دەرکەوتووە بەم شێوەیە زۆر ئاسوودەم. بڕوام پێ بکەن بە ڕاستیمە!»

پێموا بوو ئەو قسەیەی بە شادی و نەشەیەکی ناسرووشتییەوە دەربڕی.

کاتیا گوتی: «ئەیەڕۆ، بەدبەخت نەخۆم! ئاغا بە سی و شەش ساڵ تەمەنەوە خۆی بە پیر دەزانێ!»

«دەی جا دیارە پیر بووم! کاتێک پیاوێک ئاواتی دانیشتن بێ پیرە ئیتر، خۆ پیر شاخ و باڵی نییە. بۆ ژن هێنان ورە و مەیلێکی تر پێویستە. فەرموو لە ئەو بپرسە!» بەسەر ئاماژەی بە من کرد و گوتیشی: «کەسانێکی وەک ئەو دەبێ ژیانی هاوبەش پێک بێنن. من و تۆش دەبێ بە بەختەوەریی ئەوان شادمان بین.»

خەم و خۆخواردنەوەیەک لە قسەکانیدا هەست پێدەکرا کە من زوو تێی گەیشتم. تۆزێ بێدەنگ بوو. من و کاتیاش هەروا سەرمان داخست و هیچمان نەگوت.

---

١- کاتیا سووکەڵە ناوی کاترینایە.

٢- دەیویست بڵێ ماشا و قسەکەی قووت دایەوە. ماشا سووکەڵە ناوی خۆمانەی مارییایە.

لەسەر کورسییەکە نەختێ سوورِا و درێژەی پێدا: «ئێستا وای دانێین نێوچاوانەکەم نەیهێناوە و لەگەڵ کچێکی حەڤدە ساڵانەی وەک ماش٢... ماریا ئەلکساندۆڤنا...ئەمە نموونەیەکی باشە، ژیانی هاوبەشم پێک هێنا، زۆرم پێخۆشە کە ئەوە هاتە پێشێ. ئەمە بە ڕاستی باشترین نموونەیە.

من پێکەنیم و تێگەیشتم چیی پێخۆشە و چی هاتۆتە پێشێ...

پاشان ڕووی لە من کرد و بە لەبزێکی گاڵتە ئامێزەوە گوتی: «ئێستا ئێوە ڕاستییەکەیم پێ بڵێن، سادقانە و بەبێ هیچ لە ڕوو دامانێک. ئەگەر بڕیار بێ ژیانی هاوبەش لەگەڵ پیاوێک پێک بێنی کە ئاواتی دانیشتن و گۆشەگیری و حەسانەوەیە، ئێستا کە خودا دەزانێ چەندە ئاوات و ئارەزوو لە دڵتاندا شەپۆل دەدا، بۆ ئێوە تاڵ و کارەساتبار نییە؟»

من بەو پرسیارەی ئەو ڕەنگم هەڵبزرکا و زۆرم پێ ناخۆش بوو. چونکە نەمدەزانی چ وەڵامێکی بدەمەوە.

ئەو بە پێکەنینەوە گوتی: «ئێستا پێت وانەبێ من بەو قسەیە داوای ئەوەت لێ دەکەم شووم پێ بکەی. بەڵام ڕاستییەکەی بڵێ، کاتێک شەوانە لە نێو باخەکەدا پیاسە دەکەی خەیاڵی مێردێکی وا دێتە مێشکتەوە یان نا؟ ئەگەر ببێ پێت وانییە کارەسات دەبێ؟»

-«نا، بۆ کارەساتە؟»

-«بەڵام خەون و خولیایەکی شیرینیش نابێ؟»

-«ڕەنگە نەبێ، بەڵام ڕەنگە من هەڵە بکەم...»

بەڵام ئەو دیسان قسەکەی پێ بڕیم.

-«باشە، نەمگوت؟ ئەو بەڕاستی مافی خۆیەتی وابیر بکاتەوە و منیش بۆ ئەو ڕاستوێژییە زۆری سپاس دەکەم. زۆریش خۆشحاڵم کە قسەکانمان کێشایە ئەو بارە و باسی ئەو شتانەمان کرد.» پاشان گوتی: «دەبێ بڵێم زەماوەندێکی ئاوا بۆ من بەڕاستی کارەساتێکی گەورە دەبێ.»

کاتیا گوتی: «ئێوەش خەیاڵی سەیر و سەمەرە لەسەرتان دەدا! بە ڕاستی ئەو خەیاڵانەی ئێوە لە مێشکی هیچ شێتێکیشدا نییە و ئاوا بیر ناکاتەوە.» ئەوەی گوت و ڕۆیشت نان و سفرەی شێو ئامادە بکات.

دوای ڕۆیشتنی کاتیا ئێمە هەردووکمان بێدەنگ بووین و دەوروبەریشمان هەمووی ئارام بوو و شنەی گەڵا و ویزەی باڵی مێشوولەش نەدەهات. تەنیا جاروبار چریکەی بولبولێکی تر وەک ئێواره، دەهاتە گوێ، شەو بوو و بەبێ پەلەکردن دەیچریکاند و پڕ بە باخەکە دەیخوێند، بولبولێکی دیکەش لە دوورەوە و لەو پەڕی باخەکەوە و لەنێو شیوێکەوە کە دەوری باخەکەی لێدەدا، لەو شەوەدا بۆ یەکەم جار وەڵامی چریکەی ئەمی دەدایەوە. یەکەمی تۆزێک بێدەنگ بوو، وەک ئەوەی بیهەوێ گوێ بۆ پەیامی هاوڕێکەی هەڵخات، بەڵام دواتر بە چریکەیەکی لێبڕاوانەتر و ئاوازێکی گەرمتر پانتای باخەکەی پڕ کرد، دەتگوت بارانی مرواری بەسەر باخ و چیمەنەکەدا دەبارێ. ئەو دوو بولبولە بە ئاوازێکی شەیدایانە و ئاسمانی لە جیهانی بولبولاندا کە بۆ ئێمە نامۆ بوو فەزای باخەکەیان دەڕازاندەوە. باخەوان بە لای ساباتەکەدا تێدەپەڕی و ڕۆیشت لە نێو نارنجستانەکە بخەوێ، تەپەی پێی بەو پۆستاڵە قورسانەوە لە پێچەڵاوپووچی توولەڕێکەدا دەنگی دەدایەوە و دوور دەکەوتەوە. کەسێک دووجار لەو پەڕی شیوەکەوە فیتووی لێدا و دەنگی فیتووەکەی زۆر ناخۆش بوو و دیسان بێدەنگی وڵاتی داگرتەوە. خشەی جووڵانەوەی گەڵایەک یان لەرینەوەی پەردەی ساباتەکە زۆر بە زەحمەت دەبیسترا. بەرامەیەکی خۆش فەزای باخەکەی داگرت و گەیشتە بن ساباتەکە و بە هەموو لایەکدا بڵاو بۆوە. دوای ئەو قسانەی کردبوومان ئەو بێدەنگییە زۆری ناڕەحەت کردم بەڵام نەمدەزانی بڵێم چی. چاوم لە ئەو دەکرد. چاوی ئەویش لە تاریکییەکەدا دەدرەوشایەوە و لە منی دەڕوانی...

گوتی: «ژیان لەم دنیایەدا چەندە شیرینە!»

من هەناسەیەکم هەڵکێشا و گوتم: «چیت گوت؟»

ئەو دووپاتی کردەوە: «ژیان لەم دنیایەدا چەندە شیرینە!»

دیسان بێدەنگ بووینەوە و من هەروا ناڕەحەت بووم. بەردەوام لە بیری ئەوەدا بووم کە بە پشت ڕاست کردنەوەی قسەکانی سەبارەت بە پیری زویرم کردووە. دەمویست ئەو قسە نەکولێوەی خۆم قەرەبوو بکەمەوە و دڵخۆشیی بدەمەوە بەڵام نەمدەزانی چۆن.

ئاخری هەستا و گوتی: «زۆر چاکە ئیتر من دەڕۆم! دایکم بۆ شێو چاوەڕوانمە. ئەمڕۆکە چاوم پێی نەکەوتووە.»
گوتم: «بەڵام من دەمویست یەک سۆناتتان بۆ لێدەم!»
ئەو گوتی: «باشە، بۆ کاتێکی تر!» وەڵامەکەشی ساردوسڕ کەوتە بەر گوێچکەم.
-«خودات لەگەڵ بێ!»
ئێستا لێم ڕوون بوو لێم زیزبووە و هەستم بە باری قورسی خەم کرد لەسەر دڵم. لەگەڵ کاتیا هەتا سەر قاڵدرمەکانی دەرێ بەرێمان کرد و لەوێ ڕاوەستاین هەتا بە تووڵە ڕێکەدا ڕۆیشت و لە تاریکیدا بزر بوو، دوای ئەوەش ماوەیەک چاوم لە ڕێگاکە بڕی و لەجێی خۆم نەجووڵام. کاتێک زرمەی سمی ئەسپەکەشی ئیتر نەهاتە گوێ، من دەورێکی ماڵەکەم لێدا و دیسان چوومەوە بۆ ژێر ساباتەکە و چاوم لە باخەکە و تاریکایی چڕی نێودارەکان بڕی. ماوەیەکی درێژ لەبەر تەمومژی شەونمزادا کە هەموو دەنگەکانی شەوی پێوە بوو ڕاوەستام و ئەوەی دەمویست دیسان دیتم و بیستم.
ئەو دووجاری تر هات بۆ سەردانم. من کە بەبۆنەی ئاخافتنی ئەو شەوەوە ناڕەحەت بووم ئێستا ئیتر هەموو نیگەرانییەکانم لە نێو چووبوون و دەتگوت قەتم خەم نەخواردووە. هەتا کۆتایی هاوین حەوتووی دوو - سێ جار دەهات بۆ دیدەنیمان. من هێندەم خوو پێ گرتبوو کە کاتێک درەنگ چاوم پێی دەکەوت هەستم بە تەنیایی دەکرد و بەڕاستی بێ تاقەت دەبووم. بۆیە ڕقم لێی هەڵدەستا و پێم وابوو بەو کارەی دەیهەوێ ئازارم بدات و من ئەو دووری و خۆبواردنەیم بە زوڵمێک دەزانی دەرهەق بەخۆم. جۆرێک هەڵسوکەوتی دەکرد لەگەڵم دەتگوت بەکوڕم دەزانێ، هاوڕێیەکی خۆشەویست؛ ئەو سەبارەت بە هەموو شتێک لەگەڵم دەدوا و پرسیاری لێ دەکردم و چاوەڕوانیی ئەوەی لێم هەبوو کە هەموو شتێکی سادقانە و بە بێ پەردە بۆ بدرکێنم و ئەوەی هەیە و نییە لەگەڵی بێنمە گۆڕێ. ڕێگای پێ نیشان دەدام و بۆ هێندێ کار هانی دەدام، یان بڕێ جار لەسەر هەڵەیەک سەرکۆنەی دەکردم. بەڵام سەرەڕای ئەوەی بەردەوام هەوڵی دەدا خۆی بێنێتە ڕێزەی من و وەک هاوڕێیەک هەڵسوکەوتم لەگەڵ بکات، هەستم دەکرد لەپشت ئەو شتەوە کە دەیبینم و تێی دەگەم جیهانێکی تر هەیە کە زۆر ڕازاوییە و

بۆ من نەناسراوە و سەرم لێی دەرناچێ، ئەویش بە پێویستی نەدەزانی ئەو تەمە بڕەوێنێ و بەرەو ئەو ڕێگایە دەستم بگرێ، هەر ئەوەش بووبووە هۆی ئەوەی ڕێزێکی زۆرم هەبێ و خۆشەویستییەکەی لە دڵمدا ڕەگاژۆ بکات. من لە کاتیا و هێندێک لە جیرانەکانم بیستبوو کە ئەو، جگە لە چاوەدێری و خزمەت کردنی دایکە پیرەکەی کە لە ماڵی ئە دەژیا و جگە لە کاروباری ملکەکەی خۆی و سەرپەرستی و قەویتیی ئێمە کە لە ئەستۆی گرتبوو، لە کۆڕی ئەشرافیش[٨] هێندێ ئەرکی پێ پسێردرا بوو کە هەر ئەوە تاڕادەیەک تووشی چەرمەسەری و کێشەی کردبوو. بەڵام سەبارەت بەوەی کە چۆن دەڕوانێتە ئەو ئەرک و دەردەسەرییانە و لەسەریەک لەمەڕ بیر و باوەڕ و فیکر و گەلاڵەکانی داهاتوویەوە و هیوا و ئاواتەکانی ژیانی نەمتوانی هیچ هەڵکڕێنم. هەر کەڕەتێک دەمویست باسەکە بێنمە سەر کاروبارەکانی ئەو بە شێوەی تایبەتی خۆی نێوچاوانی تێکدەنا و دەتگوت دەیهەوێ بڵێ: «لەوە گەڕێ کچێ، تۆ چکارت بەو کارانە داوە، سەرت نایێشێ پرێسکەی تێدەبەستی!» و باسەکەی دەگۆڕی. بەڵام ئەو ئاکارەی ئەو سەرەتا دڵمەندی دەکردم، بەڵام دواتر پێی ڕاهاتم و ئیتر هەوڵم دەدا تەنیا باسی ئەو شتانە بکەم کە پێوەندیی بە خۆمەوە هەیە و وای لێ هات کە ئەو شێوە هەڵسوکەوتەش بەلامەوە ئاسایی دەنواند.

شتێکی تر کە لە سەرەتادا زۆرم پێ ناخۆش بوو، بەڵام دواتر پێی ڕاهاتم و حەزیشم پێ دەکرد، کەمتەرخەمی و بەهێند نەگرتنی سەروپۆتراک و ڕواڵەتی من بوو، دەتگوت ئەوە بە لایەوە بێ بایەخە و بە شتێکی سووکی دەزانێ. قەت بە وشە یان تەوس و تانە ئاماژەی بە جوانیی من نەدەکرد و بە پێچەوانەوە هەر جارێکیش کە دەوروبەرییەکان لەلای ئەو باسی جوانیی ڕوخساری منیان دەکرد، ئەو گرژ دەبوو یان بزەیەکی مانادار دەنیشتە سەر لێوی. تەنانەت حەزی دەکرد عەیبێکی چکۆڵە لە ڕوخسار و ڕواڵەتم بدۆزێتەوە، یان ئیرادێک لە هەڵسوکەوتم بگرێ و بیداتەوە بە چاومدا و داخ بنێتە سەر دڵم. جلوبەرگی مۆدەی ڕۆژ کە

---

[٨] بە پێی ڕاگەیەنراوی ئەشراف کە کاترینی دووەم ڕایگەیاند ئەشراف مافی ئەوەیان بوو لە هەموو پارێزگایەک ئەنجومەنێکیان هەبێ لە ژێر چاوەدێریی سەرۆکێکدا(کە مەقامی سەرەک ئەشرافی هەبوو). ئەم سەرۆکە و خاوەنانی هێندێک پلەی گرینگ وەک قازی و سەرۆکی پۆلیس و هتد لە لایەن ئەندامانی ئەم ئەنجومەنەوە هەڵدەبژێردران و بەشێکی بەرچاوی کاروباری پارێزگا ئەو ئەنجومەنە هەڵیدەسووڕاند و پێی ڕادەگەیشت.

لەبەرم دەکرد یان شێوەیەک کە کاتیا حەزی لێ دەکرد لە ڕۆژانی جەژندا لەبەری بکەم، یان قژم بەو مۆدەی دڵخوازی ئەو بوو دابهێنم، خێرا تیخی تەشەر و توانجی سێرگی میخائیلۆڤیچی تیژ دەکرد و دەبووە هۆی زویر بوونی کاتیای بێچارە و منیش بەو کارە لە دین دەردەچووم. کاتیا بە دڵ دەیزانی و لێی ڕوون بوو کە ئەو منی خۆش دەوێ و بە هیچ شێوەیەک نەیدەتوانی تێ بگات کە چۆن دەکرێ پیاوێک پێی خۆش نەبێ ژنە خۆشەویستەکەی بە باشترین شێوە خۆی بڕازێنێتەوە. من زۆر زوو بۆم دەرکەوت مەبەستی چییە. ئەو دەیویست دڵنیا بێ کە من ئەهلی دڵبەری و دڵداری نیم و منیش کە ئەوەم بۆ دەرکەوت ڕێژەیەک خۆنواندن و دڵڕفێنی و خۆڕازاندنەوە و لارولەنجەی دلبەرانە لە دڵمدا نەمایەوە و بە جێی ئەو جۆرێکی تر خۆنواندن لە ناخمدا سەری هەڵدا کە ئەویش خۆڕانان بە ساکارییەوە بوو کە لەگەڵ تەمەنم زۆر ناسازگار بوو لە ڕادەبەدەریش زەق و بەرچاو بوو، بۆیە ئەوی چاوی پێم بکەوتبایە دەیزانی ئەو هەڵسوکەوت و ئاکارەم سروشتی نییە. دەمزانی خۆشی دەویم بەلام بەو ڕادەیە  گرنگیم پێ نەدابوو کە بزانم خۆشەویستییەکەی بۆ من ئەوینێکی ئاگرینە بۆ ژنێک یان سۆز و خۆشەویستی بۆ مندالێک. ئەو هۆگرییەی زۆر بە لامەوە پیرۆز بوو و هەستم دەکرد کە بۆ ئەو باشترین کچی دنیام و هەڵبەت حەزم دەکرد ئەو وەهمە لە زەینیدا بمێنێ و بێ ئیختیار فریوم دەدا، لەگەڵ ئەو فریودانەش هەوڵم دەدا عەیب و کەموکووڕییەکانی خۆم لە نێو بەرم و هەستم دەکرد بۆ من باشتر و بەرێوجێتر ئەوەیە کە لایەنە باش و خەسڵەتە دەروونییەکانی خۆمی بۆ دەرخەم نەک دیمەنی جوانی ڕواڵەتم. پێم وابوو بسک و دەست و ڕوخسار و خووخدە و هەڵسوکەوتم بە جوان و ناشیرینەوە هەموو لە یەکەم ڕوانیندا دیتووە و لە ڕوانگەی خۆیەوە هەڵیسەنگاندووە، بۆیە دەیزانی من جگە لە ڕێگای هەڵفریواندن ناتوانم هیچ شتێکی تر بە ڕواڵەتم زیاد بکەم. بەلام ئاگای لە ڕۆحم نەبوو کە شێت و شەیدای ئەو بووە و ئەشقی ئەو خەریکە ڕۆحم تووشی ئالوگۆڕێکی بنەڕەتی دەکات و گەشە دەکات و لەو بوارەدا دەمتوانی ئاشقی خۆمی بکەم و دڵی لێ بستێنم، چونکە بە دڵ هەستم پێکرد بوو و تێگەیشتبووم کە زۆر بە ئاسانی دەتوانم لەگەڵی دانیشم و قسەی لەگەڵدا بکەم. وردەوردە شەرمنیی بێ هۆ و هەڵسوکەوتی

ناشارەزایانە و ناسروشتیی پێشووم هیچی نەما و لە هەمبەریدا ڕووم کرایەوە. هەستم دەکرد لە هەموو بارێک لەشولارم دەبینێ و دەست بە سەروقژمدا دێنێ و لە دوورەوە بۆنی کەزیە و لاملم هەڵدەمژێ و ئاشقی سەرتاپامە و ئەوەی دەیبینێ بە دڵیەتی. پێم وابوو ئەگەر بەپێی خووخدەی خۆی، وەک خەڵکی کتوپر بیگوتبایە چەندە جوانی ئەو قسەیە ڕێژەیەک دڵی شاد نەدەکردم و بە پێچەوانە لە ناخی دڵەوە خۆشحاڵ بووم کاتێک قسەم دەکرد دەمدی ئەو دوای قسەکە چاوی لە چاوم دەبری و بە دەنگێک کە لە ناخی دڵیەوە دەهات و هەوڵی دەدا وەکوو گاڵتە بنوێنێ دەیگوت: «بەڵێ، بەڵێ، جادیارە شتێک لە ئێوەدا هەیە کە لە هیچکەسدا نییە. دەبێ بڵێم زۆر کچێکی باشی!»

ئێستا ئەو جۆرە پاداشانە کە دڵی لە شادی و غوروور لێوڕێژ دەکردم لە بری چ هونەرێک پێم بڕابوو؟ لە بری ئەوەی گوتبووم ئەوینی گریگۆری دەرهەق بەنەوە چکۆڵەکەی هەست پێدەکەم یان بۆ ئەوەی بەخوێندنەوەی فلان شێعر یان چیرۆک فرمێسک دەزێتە چاوم یان ئەوەی مۆتسارتم لە شوولهۆف[٩] زیاتر خۆش دەوێ. لە دڵی خۆمدا دەمگوت: «سەیرە. بە چ هەستێکی تیژ و ئەنگێوە تێگەیشتم کە چ شتێکی باش و خۆشەویستە.» ئەگەرچی لەو کاتەدا هێشتا لە باشە سەرم دەرنەدەچوو یان ئەوەی کە چ شتێک شایانی خۆشویستنە. زۆربەی خووخدە و سەلیقەکانی ئەو سەردەمەی من بە دڵی ئەو نەبوو و تەنیا جووڵانێکی برۆ یان ڕوانینێکی بەس بوو کە تێبگەم ئەوەی دەمهەوێ بیڵێم پێی خۆش نییە. حاڵەتێکی تایبەتی ڕوخساری ئەو کە نیشاندەری دڵسۆزی بوو بۆ من، یان دەکرێ بڵێین هێندێک سووکایەتی پێوە بوو، بەس بوو کە تێبگەم ئەوەی ساتێک لەمەوبەر حەزم پێ دەکرد ئێستا ئیتر لێی بێزارم. هێندێ جار هێشتا دەمی نەجووڵا بوو تیدەگەیشتم کە چ ڕێنوێنی یان داخوازییەکی لێم هەیە یان کاتێک چاوی لە چاوم دەبڕی و شتێکی لێ دەپرسیم هەستم دەکرد کە من بە حاڵەتی چاو و نیگایدا دەزانم ئەوەی دیهەوێ بزانێ لێمی دەردەکێشێ. بیر و هەستەکانی ئەو کاتەی من هەر ئەو بیر و هەستانەی ئەو بوو کە بێ ئیختیار لە مندا سەری هەڵدابوو. ئەو بیرانە لە لایان ئەوەوە هاتبووە نێو ژیانی منەوە و ڕووناکی دەکردەوە. بەبێ

---

[٩] schlhof

ئەوەی خۆشم بزانم سەیری هەر شتێکم دەکرد بە چاوی ئەو دەمڕوانی و کاتیا و خزمەتکارەکان و سۆنیا و خۆم و سەرگەرمییەکانیشم بە چاوی ئەو دەدی. ئەو کتێبانەی کە لە ڕابرووددا تەنیا بۆ تاراندنی خەم و خەفەت دەمخوێندنەوە لە ناکاو لەبەر چاوم بوونە باشترین کتێب کە خۆش و بێگەردترین چێژەکانی ژیانی پێ دەبەخشیم و ئەوەش تەنیا بەو هۆیە بوو کە لەگەڵ ئەو سەبارەت بەو کتێبانە قسەمان دەکرد یان پێکەوە دەمانخوێندنەوە یان ئەو بۆی دەخوێندمەوە. لە ڕابردوودا دەرسەکانی سۆنیا و سەروکەللەلێدان لەگەڵ ئەو بۆم بووبوو بە ئەرکێکی قورس و دژوار و من خۆم ناچار دەکرد ئەو ئەرکە بەجێ بێنم. بەڵام کاتێک ئەو دەهاتە سەر دەرسەکەمان و گرنگیی بە پێشکەوتنەکانی سۆنیا دەدا من لە خۆشیانا گەزگەز باڵام دەکرد و چێژم لە دەرس کوتنەوە وەردەگرت. لە ڕابردوودا فێربوونی پارچە مۆسیقایەک و لە بیر نەچوونەوەی بەلامەوە کارێکی دژوار و تەنانەت مەحاڵیش بوو؛ بەڵام ئێستا کە دەمزانی ئەو گوێم بۆ شل دەکات و تێم دەگا و هانم دەدا چل جار لەسەر یەک پارچە مۆسیقایەکم لێدەدا بە جۆرێک کە کاتیای بێچارە لۆکەی لە گوێچکەی خۆی دەخست، بەڵام هێشتا لێی ماندوو نەدەبووم و سات لە دوای سات تامەزرۆتر دەبووم. سۆناتە دووپاتەکانی قەدیمی نازانم بۆ لە بەر چاوم گۆڕا بوون. ئەوانم بە شێوەیەکی نوێ دەژەنی کە زۆر ڕوونو باشتر بوون و چێژی تایبەتیان پێوە بوو. تەنانەت کاتیاش کە زۆرم خۆش دەویست و وەک خۆم دەمناسی لەبەر چاوم گۆڕا بوو. ئێستا تێدەگەم کە ئەو قەت ئەو ئەرکە لەسەر شانی نەبوو کە دایکایەتی بۆ ئێمە بکات و هاودەمێکی ئاوا فیداکار و بەو شێوە دڵسۆز لە خزمەتی ئێمەدا بێ. تازە هۆگری و دڵسۆزیی سادقانەی ئەو خۆشەویستەم بۆ دەردەکەوت کە ئێمەی وەک جگەر گۆشەی خۆی چاو لێدەکرد و دەمزانی چ هەقێکی بەسەر ئێمەوە هەیە و چەندە چەندەی زەحمەت بۆ کێشاوین. بۆیە خۆشەویستیی ئەو ئافرەتە فیداکارە زیاتر لە دڵمدا جێگیر دەبوو. ئەو بوو کە منی فێرکرد چاوێک لە حاڵی ژێر دەستان و ڕەعیەتەکان، تا دەگاتە خزمەتکارانی ماڵێ بکەم و بە چاوێکی تازە لێیان بڕوانم. ئەگەرچی هێندێ پێکەنینییە بەڵام دەبێ بڵێم من هەتا تەمەنی حەڤدە ساڵان لەگەڵ خزمەتکارەکانمان گەورە بووم و ژیاوم، بەڵام لەبەر چاوم ئەوان نامۆتر لەو

کەسانە بوون کە قەتم نەدیبوون. بۆ تاقە جارێکیش نەکەوتمە بیری ئەوەی کە ئەم مرۆڤانەش وەک من دڵێکی پڕ لە سۆز لە سینگیاندا هەیە یان هێندێ جار ئاواتی شتێکیان لە دڵدایە یان لەوانەیە خەمێک لە دڵیاندا بێ. باغ، لێڕەوار و مەزراکانمان لە ماوەی ئەو ساڵانەدا کە لەبەر چاوم ئاساییان دەنواند لە ناکاو لەبەر چاوم ڕەنگ و دیمەنێکی نوێیان بە خۆوە گرتبوو. ئەو هەقی بوو کە دەیگوت بەختەوەریی ڕاستەقینە لە ژیاندا تەنیا یەک شتە و ئەویش ئەوەیە کە مرۆڤ بۆ کەسێکی تر بژی. پێشتر ئەو قسەیەی ئەوم زۆر پێ سەیر بوو و بە شتێکی بێ مانام دەزانی. بەڵام بڕوا بەو کارە بێ ئەوەی خۆم ئاگادار بم لە دڵمدا ڕەگاژۆی دەکرد. ئەو دڵی بەرەو دنیایەکی پڕ لە شادی دەکردمەوە بێ ئەوەی گۆڕانێک بەسەر ژیانمدا بێنێ، یان شتێکی پێ زیاد بکات. تەنیا بوونی خۆی بوو تێکەڵ هەست و ڕۆح و گیانم دەبوو. ئەوەی لە منداڵییەوە لە دەور و بەری من وشک و بێدەنگ بوو، بە هاتنەوەی ئەو ڕۆحی بە بەردا کرایەوە و زمانی گرت و پەلەی بوو و دەیویست بزێتە نێو ڕۆح و گیانم و لێوڕێژی بکات لە شیرینی.

ئەو هاوینە زیاتر دەچوومە سەرێ بۆ ژوورەکەی خۆم و لەسەر جێوبانەکەم خۆم ڕادەکێشا و بە جێی خەم و پەژارەیەک کە بەهاری ڕابردوو لە ناخمدا ڕیشەی داکوتابوو، بە جێی ئاوات و هیواکانی داهاتوو، حەزی بەختەوەریی ئێستا هەموو گیانی داگرتبووم. خەو نەدەچووە چاوم، هەڵدەستام و دەچووم بۆ سەر پێخەفەکەی کاتیا و لە پاڵیدا دادەنیشتم و پێم دەگوت کە بەختەوەرم و ئەمڕۆش کە بیر لەو ڕۆژانە دەکەمەوە بۆم دەردەکەوێ کە بەختەوەرییەکەم پێویستیی بە هیچ باس کردنێک نەدەکرد و ئەو خۆی هەستی پێدەکرد. بەڵام بە منی دەگوت کە خۆشی پێویستی بە هیچ شتێک نییە و زۆر بەختەوەرە و ماچی دەکردم. من باوەڕم بە قسەکانی دەکرد و پێموا بوو پێویستە و عەداڵەتیش وای ڕێک خستووە کە هەموان بەختەوەر بن. بەڵام کاتیا لە بیری خەوەکەشیدا بوو و تەنانەت هێندێ جار خۆشی تووڕە و جاڕز نیشان دەدا و منی لە پێخەفەکەی دوور دەخستەوە و دەخەوت. منیش تا ماوەیەکی زۆر لە مێشکی خۆمدا هۆکاری بەختەوەریم لێک دەدایەوە و وەردم دەکرد. هێندێ جار هەڵدەستام و دەستم دەکرد بە دۆعا کردن، ئەمجارەیان بە زمانی خۆم، تاکوو سپاس لە خودا بکەم بۆ ئەو

بەختەوەرییەی  بە نسیبی کردووم. ژوورەکەم کڕوکپ بوو. تەنیا پرخەی نەرم و یەکهاویی کاتیا و چرکەچرکی کاتژمێرەکە دەهات و منیش لەسەر جێگاکەم ئەم شانەوشانم دەگۆڕی و ئۆقرە لێ هەڵگیرابوو و خەو نەدەچووە چاوم و دۆعام دەکرد و خاچی خۆم دەکێشا و خاچەکەی لە ملمدا بوو ماچم دەکرد. دەرگای ژوورەکە پێوەدرابوو و پەنجەرەکانیش داخرا بوون، ویزەی مێشوولەیەک لە نێو ژوورەکەدا دەهات و لە لاجە سەرم نزیک دەبۆوە و دوور دەکەوتەوە. منیش دەمویست قەت لەو ژوورە نەچمە دەرێ و تاهەتایە ڕۆژ نەبێتەوە و ئەم دۆخە خۆشە کە ڕۆحی لە ئامێز گرتووم هەروا بمێنێتەوە و ئەم حاڵە شیرینەم لێ تێک نەچێ. پێم وابوو خولیا و بیر و دۆعاکانم هەموویان بوونەوەرێکی گیانلەبەرن و لەو تاریکییەدا لەگەڵمدا دەژین، بە دەوری چرپا و پێخەفەکەمدا دەفڕن یان بوونەتە چەتری سەرم و بیر و خەیاڵەکانی من هەموو بیر و خەیاڵەکانی ئەون و هەستەکانیشم هەموو هەستەکانی ئەون. ئەو کاتە هێشتا نەمدەزانی ئەو حاڵەی من ئەوینی ناوە. پێم وابوو ئەم حاڵە لەوانەیە هەمیشە بۆم بێتە پێشێ و ئەم هەستە شتێکە  کە بە شێوەی بەلاش لە نێو دڵدا سەر هەڵدەدا.

## سێ

 ڕۆژێک لە کاتی دروێنەی گەنمدا، دوانیوەڕۆ لەگەڵ کاتیا و سۆنیا چووین بۆ نێو باخەکە و لەسەر کورسییەک کە زنجی خەڵوەتی هەمیشەمان بوو و لەوێ خەم و دەردەدڵەکانمان بەیان دەکرد و بە باماندا دەدا، لەژێر سێبەری زیزفۆنێکی لێواری شیوەکە، کە لەو بەری ئەوەوە دیمەنی دارستان و مەزراکان دیار بوون، دانیشتین. سێ ڕۆژ بوو کە سێرگی میخائیلوڤیچ نەهاتبوو بۆ سەردانمان. ئەو ڕۆژە چاوەڕوانی بووین، بەتایبەت لەبەر ئەوەی بە گزیرەکەمانی گوتبوو کە بۆ پێڕاگەیشتنی گەنم و دروێنەوانەکان دێ بۆ مەزراکە. نزیک کاتژمێر دوو لە دوورەوە چاومان پێی کەوت بە سواری ئەسپ لە مەزرای چاودارەوە دەهات. کاتیا چاوێکی لە من کرد و بزەی هاتێ و فەرمانی دا کۆخ و گێلاس بێنن کە سێرگی

میخائیلوڤیچ زۆر حەزی لێ دەکرد. پاشان لەسەر کورسییەکە پاڵی دایەوە و چاوی قووچاند و خۆی کردە خەو. من لقێکی خوار و پڕ گەڵای زیزفۆنم شکاندەوە، لەگەڵ ئەوەی دەستم هەموو بە شیلەی ساقەتەکەی تەڕبوو، ملم نا لە باوەشێنی کاتیا و لەگەڵ ئەوەشدا کتێبم دەخوێندەوە. بەڵام لەپەستا سەرم هەڵدێنا و چاوێکم لە توولەرێی مەزراکە دەکرد کە سێرگی میخائیلوڤیچ لەوێوە دەهات. سۆنیا خەریک بوو لەبن دارەکە بە خۆڵ و چیلکە و بەرد خانووچکەی بۆ بوکەڵەکەی دروست دەکرد. ڕۆژێکی گەرم بوو و با سریوەی نەدەهات، هەواکەی مات و هەورێکی تەنک ئاسمانی داگرتبوو. لە بەیانییەوە هەواکەی دیار بوو گژەبا و تۆفانی پێوەیە و بە شێوەی ئاسایی بەر لە تۆفان ئۆقرەم لێ هەڵدەگیرا، بەڵام لای عەسر هەورەکان ڕەوینەوە و خۆر بە تەوێڵی ئاسمانی هەساوەوە پێکەنی و تەنیا لە ئاسۆیەکی دووردەستەوە جارجار گرمەی هەورێک دەهات و گەواڵە هەورێکی ڕەش کە بەدەم ئاسۆوە مابوو لەگەڵ غوباری سەحرا تێکەڵ دەبوو. جاروبار trووسکەی هەورە برووسکەیەک درزی دەخستە نێوچاوانی ئاسۆ و دەگەیشتە ترۆپکی کێوەکان و بۆ چرکەیەک زەوی و ئاسمانی پێکەوە گرێ دەدا. دیار بوو تۆفان تێپەڕیوە و لانی کەم ئەو ڕۆژە ئیتر کاری بەسەرمانەوە نابێ. بە جادەی پشت باخەکەدا بەردەوام عارەبانەی پڕ لە کلۆش و باقەی گەنم کە بە قەد دوو باڵا پیاویان لەسەر هەڵچنیبوون و جیڕەجیڕی تایەکانیان دەهات، بە قورسی بەرەو ئەم لایە دەهاتن و عارەبانەی خاڵی بە تەقوکوت و خێرا بەرەو مەزرا دەگەڕانەوە و دروێنەوان و عارەبانەچییەکان لاقیان بە لێواری عارەبانەکەدا شۆڕ کردبۆوە و کراسەکانیان بەدەم باوە دەشەکانەوە. تەپوتۆزێکی چڕ کە لەڕێگەکە هەڵدەستا، نە دەڕەوییەوە و نە دەنیشتەوە، ئێمەش لە پشت لک و پۆپی دارەکانەوە دەماندی. لە مەودایەکی دوورتر لە خەرمانەکەوە دەنگی جیڕەجیڕی تایەی عارەبانە و چرەوگوڕەی دروێنەوانەکان دەهاتە گوێ و ئەو باقە و کلۆشانەیبە سەر عارەبانەوە لە پشت باخەکەوە تێپەڕیبوون دەماندی لە سەر خەرمانەکە کۆما دەکرێن و دەبێتە خۆیانێک و ئامادەی دەکەن بۆ گێرە کردن. من خەرمانە هیلکەییەکانم دەدی کە بە نووکی تیژەوە جار لەگەڵ جار بەرزتر دەبوونەوە و شێوەی سەربانی ماڵۆچکەی پووشینەیان دەدا بەردەوام

بەرزتر دەبوونەوە و پاڵە و سەپان بە دەوریدا هەڵدەسووڕان. بەرەو ڕووی من لەنێو گەنمجارە پڕ تەپوتۆزەکەشدا عارەبانە خەریکی هاتوچۆبوون و لەوێوە باقەی زێڕینی گەنم وەبەر چاو دەکەوتن و دەنگی جیڕە و تەقوکوتی عارەبانە و ئاواز و گۆرانیی دروێنەوانەکان لە دوورەوە دەکەوتە بەر گوێ. لە لایەکی کێڵگەکەوە، گەنمجاڕی دروێنەکراو جارلەگەڵ جار بەربلاوتر دەبوو و ڕیزی دروێنەوان بەریان لێ دەگرت و لە دوای خۆیانەوە بە نارێکی سواڵە و مەڵۆیان بەجێدەهێشت. ناوەی نێوان کێڵگەکان کە چەقچەقەی گوڵ شینی لێ ڕوابوو، هەروەها کراسی رەنگاوڕەنگی ژنانی گوندنشین کە داهاتبوونەوە و لەدوای دروێنەوانەکانەوە دەڕۆیشتن و خەریکی بەستنی باقە و گوڵچنینەوە بوون، جوانییەکی تایبەتی بە مەزراکە بەخشیبوو و دڵی پێ شاد دەبوو. کاتێک دەتڕوانییە پشت سەری ژنەکان و ڕیزی ڕێک و تەکووزی باقەکانت دەدی کە بەسترا بوون و بە مەودای دیاری کراو دادەندران، شێواویی کێڵگەکە نەزم و ڕێکوپێکیی بە خۆوە دەدی و لەبەر چاوم دەتگوت لەناکاو هاوین بۆتە پاییز. تەپوتۆز و گەرما هەموو دەشتەکەی داگرتبوو و تەنیا دەستی بەو زنجە خەڵوەت و دڵگرەی ئێمە نەگەیشتبوو، دەنا خەڵکی زەحمەتکێش لە ژێر قرچە و کوڵەکوڵی هەتاوی چلەی هاویندا و لەنێو ئەو گەرما و تەپوتۆزەدا قسەیان دەکرد و خەریکی گاڵتە و چرەوگوڕە بوون و ئاو ڕاوەستایە ئەوان ڕانەدەوەستان. کاتیا لەسەر کورسییەکی بەر سێبەرە فێنکەکە ڕاکشابوو و لە حەوت ساڵان ڕاست بووبۆوە و لەژێر لەچکەیەکی مەلمەلی سپی کە دەموچاوی پێ داپۆشیبوو بە نەرمی و شیرینی پرخەی دەهات. گێلاسی ڕەش و ئاودار لەسەر دەورییەک بریقەی دەهات و کراسەکانی ئێمە خاوێن و فێنک بوون و ئاوی نێو دۆلکەکە زوڵاڵ و تازە و ڕووناک، تیشکی خۆر لە نێوان لقەکانەوە دەڕژایە نێوی و بووبووە شەبەنگ و چاوی دەلاواندەوە و من دڵم خۆش بوو و لەبەر خۆمەوە دەمگوت: «چبکەم؟ خەتای من چییە بەختەوەرم؟ بەڵام چۆن دەتوانم هەمووان لەو بەختەوەرییەی خۆمدا بەشدار بکەم؟ کێ هەیە کە خۆم و هەموو بەختەوەرییەکانی خۆمی پێ ببەخشم.»

خۆر لە پشت چڵەپۆپەی دارەکاندا خۆی حەشار دابوو، تۆز و غوماری سەحرا ڕەویبۆوە و ئاسۆ لەژێر ترووسکەی شەفتوولی هەتاودا ڕووناکتر و درەوشاوەتری دەنواند، هەورەکان هەمووی بە پانتاییی ئاسماندا بڵاو بووبوونەوە و لە پشت دارەکانەوە لەسەر خەرمانەکە سێ خۆیانی دیکە هەڵچندرا بوو و فەلاو سەپانەکان بە دەوریدا دەهاتن. عارەبانەکان دیار بوو بۆ دوایین جار باریان دەهێنا. ژنانی گوندنشین شەنە لەسەر شان و کۆڵی پڕ لە گوڵە گەنم بە کۆڵەوە بە دەنگی بەرز و بەدەم گۆرانی گوتنەوە بەرەو ماڵ دەچوونەوە سێرگی میخائیلوڤیچ لە هیچ کوێ دیار نەبوو، ئەگەرچی چەند کاتژمێر لەمەو بەر دیتم بە سواری ئەسپ بە توولەڕێی سەرەوخواری ئەو دیوی باخەکەدا دەهات بۆ ئەم لایەوە. لە ناکاو لە لایەکەوە کە چاوەڕوانی نەبووم وەدیار کەوت. دەورێکی شیوەکەی لێدا بوو و کڵاوەکەی لەسەری داگرتبوو، خێرا و بەهەڵەداوان دەهات بۆ لای من و ڕوخساری ترووسکەی شادیی تێگەڕا بوو. کە دیتی کاتیا خەوی لێکەوتووە لێوی خۆی گەست و بە پێدزە و لەسەر نووکی لاقی هاتە پێشێ. دیتم زۆر دڵی خۆشە، هەر ئەو شادییە بێ هۆیەی کە من زۆرم حەز پێدەکرد و ناوم نابوو "ئەشقی سروشتی" دەتگوت کوڕێژگەیەکە لە قوتابخانە ڕایکردووە و حەزی ژیان و شادی و بزۆزییەکی منداڵانە لە هەموو گیانی دەباری.

لێم نزیک بۆوە و لەگەڵ گوشینی دەستم بە سرتە گوتی: «دەی چۆنی، خاتوو وەنەوشەی تازە پشکووتو، حاڵت چۆنە، باشی؟» لە وەڵامی مندا کە حاڵیم لێ پرسی گوتی: «من حاڵم زۆر باشە. ئەمڕۆ سێزدە ساڵانم و حەز دەکەم وەک ئەسپێک غار بدەم و بە هەموو دارەکاندا هەڵگەڕێم.»

چاوم لە چاوە پڕ بزەکانی بڕی و گوتم: «ئەشقی سروشتیها؟» هەستم کرد ئەو ئەشقە سروشتییەی شوێنی لەسەر منیش داناوە.

وەڵامی دایەوە: «بەڵێ!» چاوێکی قرتاند و لەگەڵ ئەوەی ددانی بە خۆیدا دەگرت پێنەکەنێ گوتی: «تەنیا نازانم چکارت بە لووتی کاترینا کارلۆڤنا داوە؟» من کە ئاگام لە خۆم بڕابوو و لەگەڵ ئەوە چاوم لە ئەو بڕیبوو هەروا کاتیام باوەشێن دەکرد و نەمزانیبوو لەچکەکە لەسەر دموچاوی لادراوە و گەڵای لقە دارەکە لە سەروچاوی دەدرێ، دەستم کرد بە پێکەنین.

به سرته، وەک ئەوەی حەز نەکەم کاتیا خەبەری بێتەوە، بەڵام لە ڕاستیدا چونکە پێم خۆش بوو بە سرتە لەگەڵی بدوێم، گوتم: «ئێستا ئەگەر لەخۆی بپرسی دەڵێ خەو نەچۆتە چاوی و هەر بەخەبەریش بووە.»

ئەویش بە جووڵاندنەوەی لێوی و لاسایی کردنەوەی من یانی هێندە بە سووکی قسەم کردووە لێم حاڵی نەبووە. کە چاوی بە دەورییی پڕ لە گێلاس کەوت، یانیها بە دزییەوە دەستی بۆ دەبا، هەڵی گرت و ڕۆیشت بۆ لای سۆنیا لە بن دارەکە و لەسەر بووکەکانی دانیشت. سۆنیا سەرەتا تووڕە بوو بەڵام سێرگی میخائیلۆڤیچ خێرا دڵخۆشیی دایەوە و دەستی کرد بە یاری کردن لەگەڵی و پێکەوە دەستیان کرد بە کێبەرکێی گێلاس خواردن.

گوتم: «پێتان خۆشە بڵێم گێلاسی دیکەشتان بۆ بێنن؟ یان چۆنە خۆمان بچین لێکەینەوە؟»

ئەو دەورییەکەی هەڵگرت و بووکەڵەکانی خستە نێویەوە و سێ بە سێ چووین بۆ نێو باخەکە. سۆنیا بە دوای ئێمەدا هەڵدەهات، پێدەکەنی و شاقەلی چاکەتەکەی سێرگی میخائیلیچی گرتبوو و دەیویست بووکەڵەکانی لێ بستێنێتەوە. سێرگی میخائیلیچ بووکۆکەکانی پێدایەوە و ڕووی لەمن کرد و ئەگەرچی ئیتر هیچ کەسی لێ نەبوو بە دەنگی ئێمە خەبەری بێتەوە هەروا بە سرتە گوتی: «ئاخەر چۆن دەڵێیت خاتوو وەنەوشە نیت؟ من لەو دۆزەخ و تەپوتۆز و گەرمایەوە بەو زەحمەتە هاتم بۆ ئێرە چونکە هەستم بە بۆن و بەرامەی وەنەوشە کردبوو، ئەویش نەک بۆنی توندی وەنەوشە، بەڵکوو بۆنی نەرمی وەنەوشەی تازە پشکووتوو کە ڕەنگێکی تۆخی هەیە و لەگەڵ بۆن و بەرامەی توانەوەی بەفر و شینکەی بەهاری تێکەڵە.»

لەگەڵ ئەوەی دەمویست ئەو شەرمە پڕ لە شادییە بشارمەوە کە وتەکەی ئاوێتەی گیانی کردبووم، لێم پرسی: «دەی، پێم بڵێ، کاروبارەکان چۆنن؟»

-«زۆر باش، نازانی ئەم خەڵکە چەندە باشن، بڕوا بکە هەتا زیاتریان دەناسی زیاتر لە دڵدا جێ دەکەنەوە و خۆشت دەوێن!»

گوتم: «بەڵێ، ئەمڕۆ بەر لەوەی ئێوە بێن، لە نێو باخەکە دانیشتبووم، چاوم لە کارەکانیان دەکرد و لەناکاو ویژدانم ناڕەحەت بوو کە ئاوا ئاسوودە و

تەوەزەل لەژێر سێبەر دانیشتبووم و دەست لە ڕەش و سپی نادەم و هێندە شادم و خۆشی ڕادەبوێرم کە...»

قسەکەی پێ بڕیم و دڵسۆزانە چاوی لە چاوم بڕی و بە لەبزێکی زۆر کارتێکەر گوتی: «دەی خۆشەویستەکەم، باش نییە بە دەربڕینی ئەم هەستانە خۆت بنوێنی. کار مەسەلەیەکی جیدییە. پیرۆزە. خودابەو ڕۆژە نەکا کە حەز بکەن هەستی ناسکی خۆتان بنوێنن.»

-«بەڵام من تەنیا لەلای ئێوە باسی هەستی خۆمم کرد!»

-«بەڵێ، دەزانم! بەڵام ئێستا باسی ئەو گێلاسانە بکە.»

دەرگای باخی میوەکە داخرا بوو و باخەوانەکانیش لە هیچ کوێ دیار نەبوون. (ئەو ئەوانی ناردبوو کە یارمەتیی دروێنەوانەکان بدەن.) سۆنیا هەڵاتەوە بۆ ماڵێ کلیلی دەرگای باخەکە بێنێ. بەڵام ئەو ماتڵ نەبوو هەتا ئەو کلیلەکە دێنێ و بە دیواری باخەکەدا هەڵگەڕا و تێل شوورەکەی هەڵدایەوە و بازی دا نێو باخەکەوە.

گوێم لە دەنگی بوو لەو دیوی دیوارەکەوە دەیگوت: «ئەگەر گێلاستان دەوێ دەورییەکەم دەنێ!»

گوتم: «نا، دەمەوێ خۆم گێلاس لێکەمەوە! دەچم کلیلەکە دێنم. دەترسم سۆنیا نەتوانێ بیبینێتەوە.»

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەمویست بزانم لە نێو باخەکەدا چی دەکا، چۆن چاو لە دارەکان دەکات و کە دەزانێ چاوی هیچ کەسی بەسەرەوە نییە چۆن بە کەیفی خۆی هەڵدەسووڕێ. لەڕاستیدا نەمدەویست بۆ چرکەیەکیش لێی دوور بکەومەوە. بە پێدزە بە نێو بنجە گەزگەزکەکاندا دەوری دیوارەکەم لێدا و چوومە ئەو شانەی تری باخەکە و ئەو شوێنەی دیوارەکەی نەویتر بوو، بەرمیلێکی خاڵی لەوێ بوو بردمە بن دیوارەکە و چوومە سەری بە جۆرێک کە زگم گەیشتە لێواری دیوارەکە. بەسەر دیوارەکەدا خۆم نووشتاندەوە و چاوم بە نێو باخەکەدا گێڕا، پیرەداری چڕوپڕی گێلاس بە گەڵای پان و مشارییەوە سەریان لێکدابوو و گێلاسی ڕەش و ئاودار و گەیشتوو لەنێوان گەڵاکاندا شۆڕ بووبوونەوە. پاشان سەرم کرد بە ژێر تێل شوورەکەدا و لە پشت لقی پڕ چڵ و گەڵای دار گێلاسێکی گەورە چاوم پێی کەوت. بە ڕاستی پێی وابوو من چووم بۆ کلیل و هیچ کەسی لێ نییە کە چاوی

بەسەریەوە بێ. کڵاوەکەی لەسەری داگرتبوو و چاوی قووچاند بوو، چووبووە سەر لقێکی دووحاچەی دارگێلاسێکی پیر و تۆپەڵێ جیوەی لێ کردبۆوە و لە بەینی قامکەکانیدا گزمووڵەی دەکرد. لەناکاو شانی هەڵتەکاند و چاوی هەڵێنا و بە زەردە خەندەوە شتێکی گوت. ئەو بزەیە و ئەوەی گوتی هێندە لەگەڵ زاتی ناسازگار بوو کە من لەوەی کە بەدزییەوە چاوی لێدەکەم زۆر پەشیمان بوومەوە. پێم وایە گوتی: «ماشا، خۆشەویستی دڵم!» لە دڵی خۆمدا گوتم: «شتی وا نابێ!» ئەو دیسان بە بزەیەکی ئارامتر و نەرم و ناسکتر دووپاتی کردەوە: «ئاخ، ماشا گیان، خۆشەویستی دڵم!» بەڵام من چەند جار ئەو وشەیەم بە ڕوونی بیست و دڵم وەها بە پڕتاو کەوتە کوتەکوت و سەرتاپام کەوتە لەرزین و شادییەکی وا ئاوێتەی ڕۆح و گیانم بوو کە بێ ئیختیار دەستم بە دیوارەکەوە گرت بۆ ئەوەی نەکەوم و خۆم ڕیسوا نەکەم. ئەو خشپەی منی بیست و واق وڕماوانە سەری بۆ لای من وەرسووڕاند و کەچاوی پێم کەوت سەری داخست، دەمودەست وەک منداڵێکی شەرمن ڕەنگی سوور هەڵگەڕا و دەتگوت تەواوی خوێنی جەستەی لە ڕوومەتیدا کۆبۆتەوە. دەیویست شتێک بڵێ، بەڵام نەیتوانی و بەردەوام ڕەنگی هەڵدەبزرکا و سوور هەڵدەگەڕایەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئاخری سەری هەڵێنا و چاوی لێکردم و زەردەیەکی گرت، منیش گرژیمەوە. شادییەک ڕوخساری گەشاندەوە. ئیتر بۆ من مامە گەورە و هاوڕێی باوکم نەبوو کە بملاوێنێتەوە و شتم فێربکات و سەرکۆنەم بکات، ئیتر پیاوێک بوو هاوشانی خۆم کە منی خۆش دەویست و لێم دەترسا، هەر وەک چۆن منیش ئەوم خۆش دەویست و لێی دەترسام. ئیتر هیچم نەگوت و تەنیا چاومان لە یەکتر کرد. بەڵام لەناکاو نێوچاوانی تێک نا و بزەی سەرلێوی ڕەوییەوە، چاوی لە بریقە کەوت و بە لەبزێکی سارد و باوکانە لەگەڵم کەوتە ئاخافتن، بە جۆرێک کە دەتگوت کارێکی نەشیاوم کرووە و ئەویش لە کارێک کە کردبووی پەشیمان بێت و وریاییم پێ بدات.

گوتی: «بڕۆ خوارێ، دەست و لاقت بریندار دەبێ. خۆت کۆڵەوار دەکەی. ئەو سەروقژە ئاڵۆزاوەت چاک کە. چاو لێکە چییت کردووە لە خۆت!»

منیش شەرمەزار و ڕەنجاو لە دڵی خۆمدا گوتم: «بۆ هەستی خۆی دەشارێتەوە؟ بۆ دەیهەوێ ئازارم بدات؟» هەر لەو کاتەشدا مەیلێکی ئاگرین دڵی داگرتم کە نەمتوانی خۆی لێ ببوێرم، بۆیە هاتمە سەر ئەوەی بیخەجڵێنم و هێزی خۆمی لەسەر تاقی بکەمەوە.

گوتم: «نا، دەمەوێ خۆم گێلاس لێکەمەوە.» نزیک ترین لقم گرت و خۆم هەڵدایە سەر دیوارەکە و پێش ئەوەی ئەو فریا کەوێ و پێشم پێ بگرێ بازم دایە نێو باخەکەوە.

گوتی: «پەککوو، چەندە کاری شێتانە دەکەی!» دیسانیش سوور هەڵگەڕا و لەگەڵ ئەوەدا تۆزێ خۆی تووڕە کرد و لەو ڕێگایەوە هەوڵی دا شەرمەزارییەکەی خۆی بشارێتەوە، گوتیشی: «بەو کارە لەوانە بوو بەڵایەک بەسەر خۆت بێنی. ئێستا چۆن دەتوانی لێرە بڕۆیە دەرێ؟»

ئەم جارەیان زۆر لە جاری پێشوو زیاتر خەجڵا بوو، بەڵام من بەو خەجڵان و پەشۆکانەی ئیتر خۆشحاڵ نەبووم. بەڵکوو دەترسام. شەرمەزارییەکەی ئەو منیشی گرتەوە. سوور هەڵگەڕام و خۆم لە چاوی دزییەوە و چونکە نەمدەزانی چی بڵێم، دەستم کردن بە گێلاس لێکردنەوە؛ ئەگەرچی هیچ دەفرێکم پێ نەبوو تێی کەم. خۆمم لۆمە دەکرد و لەو کارە شێتانەیەی خۆم پەژیوان بووم و دەترسام. پێم وابوو بەو کارەم ڕێز و ئابڕووی خۆم بۆ هەمیشە لەلای ئەو لە دەست داوە و لەبەر چاوی سووک بووم. هەردووکمان ناڕەحەت بووین و متەقمان نەدەکرد. سۆنیا بە هەڵاتن هات کلیلەکەی هێنا و ئێمەی لەو تەنگژەیە دەرباز کرد. ماوەیەکی زۆر هیچمان قسەمان نەدەکرد و هەردووکمان لەگەڵ سۆنیا دەدواین. کاتێک گەڕاینەوە بۆ لای کاتیا، ئەو لەسەر ئەوە پێداگریی دەکرد کە نەخەوتووە و هەموو قسەکانی ئێمەی گوێ لێبووە من دڵم حەسایەوە و سێرگی میخائیلیچیش دیسان هەوڵی دەدا لەبزی باوکانەی خۆی دەرهەق بە من درێژەی پێ بدات. بەڵام لەو کارەدا ئیتر سەرکەوتوو نەدەبوو و منیش ئیتر فریوم نەدەخوارد. ئێستا وتوێژی چەند ڕۆژ لەمەوبەرمانم بە جوانی وەبیر دەهاتەوە.

کاتیا گوتبووی کە پیاوان لە ژنان ئاسانتر ئاشق دەبن و باشتر دەتوانن هەستی خۆیان دەربڕن. گوتبووی: «پیاوان دەتوانن بە ژنێک بڵێن خۆشیان دەوێ، بەڵام ژنان ناتوانن.»

سێرگی میخائیلۆڤیچ وەڵامی دایەوە: «بەڵام بە بڕوای من پیاوانیش نابێ و ناتوانن بڵێن کە ژنێکیان خۆش دەوێ.»

من گوتبووم: «بۆ؟»

-«چونکە ئەگەر بڵێن، درۆیان کردووە. ئەو دەربڕینە چ مانایەکی هەیە؟ وەک ئەوە وایە لەگەڵ گوتنی «خۆشم دەوێی» پزیسکێک وەک تەقینەوە سەرهەڵبدا و ئەو ئاشق بێ، وێدەچێ لەگەڵ دەربڕینی ئەو قسەیە پەرجۆیەک ڕووبدات. دیاردەیەک خۆ بنوێنێ و ڕۆژ لە ڕۆژاواوە هەڵبێ. من پێم وایە ئەو پیاوانە دەست لەسەر دڵیان دادەنێن و بە لەبزێکی جیددی، وەک ئەوەی کارێکی گەورەیان کردبێ و شانازییان خولقاندبێ دەڵێن "خۆشم دەوێی" یان خۆیان هەڵدەخەڵەتێنن، یان لەوە خراپتر، ڕووبەڕووەکەیان هەڵدەفریوێنن.»

کاتیا پرسیبووی: «ئەگەر پیاوان ڕازی دڵی خۆیان دەرنەبڕن ژنان چۆن بزانن کەسێک خۆشی دەوێن؟»

-«من نازانم چۆن. هەر کەس زمانی تایبەتی خۆی هەیە، جگە لەوەش زمانی هەست لە هەموو زمانێک ڕوون و ئاشکراترە. من کاتێک چیرۆک دەخوێنمەوە دەیهێنمە بەر چاوی خۆم کە ئالفرێد یان ملازم سترێلسکی[١٠] کاتێک دەڵێن "ئیلئۆنۆرا، خۆشەویستەکەم، خۆشم دەوێی!" حەتمەن سیمایەکی خەمباری هەیە و پێیان وایە لەناکاو ڕووداوێکی سەیر و سەمەرە ڕوودەدا، ئەگەرچی هیچ ڕووداوێک ناقەومێ. نە لە خۆشەویستییەکەیاندا گۆڕانێک ڕوودەدا نە لە خۆیاندا. هەردووکیان هەر ئەو چاو و لووت و برۆیەیان هەیە کە پێشتر بوویان و هیچ شتێک نەگۆڕاوە.»

من هەر لەو کاتەدا هەستم کردبوو کە پەیامێکی جیددی بۆ من لەو گاڵتەیەدا شاردراوەتەوە. بەڵام کاتیا ڕێگای نەدەدا کەسێک کاری قارەمانی چیرۆکەکان بە کەم بگرێ یان گاڵتەیان پێ بکات.

---

[١٠] strelsky

گوتی: «ئێوە بۆ ئەوە نابن پیاو چاوەڕوانی قسەی جیددیتان لێ بکات. ئێستا بە ڕاستی بیڵێ، یانی تا ئێستا هیچ کات بە ژنێکت نەگوتووە خۆشم دەوێی؟»

ئەو پێکەنی و گوتی: «هیچ کات ئەوەم نەگوتووە و ناشیڵێم و قەتیش لەبەر ژنێک سەر داناخەم و چۆک دانەدەم.»

من ئەو قسانەم بە ڕوونی وەبیر دەهاتەوە و بە خۆمم دەگوت: «بەڵێ، ئەو پێویست ناکا بڵێ خۆشی دەوێم. من خۆم باش دەزانم خۆشی دەوێم و هەرچەندیش بیهەوێ خۆی بگرێ و گرینگیم پێ نەدات کەڵکی نییە و ناتوانێ ئەو باوەڕە لە دڵی من بسڕێتەوە.»

ئەو شەوە زۆر کەمی قسە لەگەڵ کردم، بەڵام من لە هەموو قسەیەکیدا لەگەڵ کاتیا و سۆنیا دەدوام و لە هەموو هەڵسوکەوت و ڕوانینێکیدا ئەشق و سۆزم دەدی و گومانم لە خۆشەویستییەکەی نەبوو. تەنیا ئەوە دڵتەنگی دەکردم و لەناخەوە هەڵیدەچۆقاندم کە نەمدەزانی بۆ چی بە پێویستی نازانێ هەستی دڵی خۆی دەربڕێ و خۆی ساردوسر و کەترەخەم دەنوێنێ؟ ئەگەرچی هەموو شتێک ڕوون و ئاشکرا بوو و زۆر بە ئاسانی دەکرا تامی شیرینی بەختەوەری بچێژین. بەڵام خۆم بە تاوانبار دەزانی کە بازم دابووە نێو باخەکەوە و چووبووم بۆلای، هەر ئەو هەست بە تاوان کردنەش زۆری ئازار دەدام. پێم وابوو ئەو بە هۆی ئەو کردەوەیەم ئیتر من بە شیاوی ڕێز و حورمەت نازانێ و ئەو کارەی من زویری کردووە.

دوای چایی هەستام و چووم بۆ هۆڵی میوانداری کە پیانۆکە لەوێ بوو، چوومە پشت پیانۆکە و ئەویش هات. لەبەر دەمم ڕاوەستا و گوتی: «هەوایەک لێدە. زۆر لە مێژە هیچم لێ نەبیستووی.»

ـ«منیش هەر بۆ ئەوە هاتم بۆ لای پیانۆکە...» ڕاست چاوم لە چاوی بڕی و لێم پرسی: «سێرگی میخائیلیچ لێم دڵمەندی؟»

ـ«نا، بۆ دەبێ لێت دڵمەند بم؟»

سوور هەڵگەڕام و گوتم: «لەبەر ئەوەی دوانیوەڕۆ بە قسەی ئێوەم نەکرد!»

لە مەبەستم تێگەیشت، سەرێکی لەقاند و بزەی هاتێ، نیگای چاوانی پێی گوتم: «هەڵبەت کارەکەت جوان نەبوو، بەڵام من وزەی ئەو کارە لە خۆمدا شک نابەم.»

لە پشت پیانۆکە دانیشتم و گوتم: «کەوایە دەکرێ بڵێین کارێکی نەشیاوم کردووە و ئێمە دۆست و هاوڕێین و لێم زویر نابی؟»

ـ«قسەی وادەکەی! جا چۆن بە شتی ئاوا نێوانمان تێک دەچێ!»

لەو هۆڵە گەورە و جێدار و بنمیچ بەرزەدا تەنیا دوو مۆم لەسەر پیانۆکە هەڵکرا بوو و لایەکانی دیکەی هۆڵەکە نیوە تاریک بوون و مانگەشەوی هاوین لە پەنجەرە ئاوەڵاکانەوە ئاگای لە ئێمە بوو. بێدەنگی باڵی بەسەر هەموو لایەکدا کێشا بوو، تەنیا جاروبار ترپەی هەنگاوی کاتیا لە داڵانە تاریکەکەوە دەهات، یان پڕمەپڕم و سم لە زەوی کوتانی ئەسپەکەی ئەو کە لەبەر پەنجەرەکەدا بەستبوویەوە. لە پشت سەرمەوە لەسەر کورسییەک دانیشبوو، بەجۆرێک کە نەمدەتوانی بیبینم. بەڵام هەنتەشی ئەو لە نێو هۆڵە نیوە تاریکەکە و هەموو شوێنێک و لە نێو ئەو دەنگانەدا کە دەبیستران و هەروەها لە نێو دڵی مندا هەستی پێدەکرا. هەموو سەرنج و جووڵانەوەیەکی، ئەگەرچی لێم دیار نەبوو، لە دڵمدا ڕەنگی دەدایەوە. من سۆناتی فانتێزیی مۆتسارتم لێدا کە ئەو خۆی بۆی هێنا بووم و من ئەو هەوایە لەلای خۆی و لەبەر دڵی ئەو فێر بووبووم. ڕێزەیەک بیرم لە لای ئەو هەوایە نەبوو کە لێم دەدا. بەڵام وادیار بوو باشم لێدەدا و هەستم کرد زۆری بەدڵە. چێژی ئەوم لەو هەوایەدا هەست پێدەکرد کە دەمژەنی و بێ ئەوەی پێویست بێ چاوی لێ بکەم هەستم بە چاوی دەکرد کە لە پشتە سەرمی بڕیبوو. هەروا کە قامکەکانم لەسەر جگی پیانۆکە لە خۆوە دەجووڵان و ئەمبارە و باریان دەکرد لەناکاو و بێ ئیختیار ئاوڕم دایەوە و چاوم لە چاوی کرد. تارمایی سەری لەبەر شۆقی کزی مۆمەکە دیار بوو. دانیشتبوو، هەنیشکی نابووە سەر چۆکی و لاڕوومەتی لەسەر لەپی دەستی دانابوو، چاوی لە من بڕیبوو و چاوانی بریقەیان دەهات. من بە دیتنی ئەو نیگایەی زەردەیەکم گرت و دەستم لە ژەنین هەڵگرت. ئەویش بزەیەکی هاتێ بەڵام بە تەشەرەوە بەسەر ئاماژەی بە دەفتەری نۆتەکە کرد کە درێژەی پێبدەم. کاتێک ژەنین تەواو بوو مانگ گەیشتبووە نێوەڕاستی ئاسمان، ڕووناکتر بوو و تریفەی زێوێنی لە پەنجەرەکەوە دەهاتە ژوورێ و لەگەڵ شۆقی کزی مۆمەکان تەرکی هۆڵەکەی ڕووناک دەکردەوە. کاتیا لۆمەی کردم کە بۆچی ئاهەنگەکەم لە جوانترین شوێندا

ڕاگرتووە و لەسەریەک زۆر خراپم ژەنیوە. بەڵام سێرگی میخائیلیچ بە پێچەوانە لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە لە هەموو جارێکم باشتر ژەنیوە. لەنێو ژوورەکاندا دەستی کرد بە پیاسە کردن و لە هۆڵەکەوە دەچوو بۆ ژووری میوانداری و لەوێوە دەهاتەوە بۆ هۆڵەکە و هەموو جارێک چاوی لە من دەکرد و بسکەی سمێڵی دەهات. من زەردەم دەگرت و تەنانەت حەزم دەکرد بەبێ هۆ پێبکەنم، چونکە ئەوەی کە ئەو ڕۆژە و لەو کاتەدا ڕووی دابوو زۆری دڵخۆش کردبووم و هەموو جارێک کە ئەو لە هۆڵەکە دەچووە دەرێ من کاتیام توند لە باوەشم دەگرت کە لە پەنامدا ڕاوەستا بوو و جێگایەکی کە لە هەموو ئانداماني ئەوم پێ جواتر بوو، یانی بەرخەبەبەی نەرم و ناسکیم ماچباران دەکرد، کاتێک ئەویش دەگەڕایەوە بۆ هۆڵەکە حاڵەتێکی جیددیم بە خۆوە دەگرت و بە زۆری ددانم بە خۆمدا دەگرت بۆ ئەوەی پێنەکەنم.

کاتیا پێی گوت: «ئەم کچە ئەم شەو بۆوای لێهاتووە؟»

بەڵام سێرگی میخائیلیچ وەڵامی نەدایەوە و تەنیا زەردەیەکی بۆ من گرت. ئەو باش دەیزانی من بۆ وادەکەم.

لە ژووری چکۆڵەی میوانداری، لەبەر دەرگای ساباتەکە کە بەرەو ڕووی باخەکە دەکرایەوە ڕاوەستا و گوتی: «بڕوانن، چ شەوێکە!»

ئێمە چووین بۆ لای. ڕاستی دەکرد. شەوێک بوو کە من قەتم شەوێکی تری لەو شێوەیەم نەدیتووە. مانگەشەو لە پشت ئێمەوە لە دیوەخانەکەی دەدا و تریفە بارانی دەکرد، ئێمە مانگمان نەدەدی و نیوەی سێبەری سەربانی دیوەخانەکە و ئەستوونەکانی و پەردەی ساباتەکە کە قیلەوقانج بە لایەکیدا شۆڕ بووبۆوە enraccourci[1] دەکەوتە سەری ڕێچکە خیزڕێژکراوەکە و چیمەنی بەر دەرگای ماڵەکەمان. شوێنەکانی تر هەمووی ڕووناک بوون ئاونگێکی زێوینی لێ نیشتبوو کە لە تریفەی مانگدا نوقم بووبوون. ڕێگای پانی باخەکە کە هەردوو بەری بە گوڵ نەخشابوو، هەتا ئەو سەری باخەکە ڕۆیشتبوو و لە تەمومژدا بزر بووبوو. نیسێی دەوەنی شیلان و داری پەرژینی باخەکە بە شێوەیەکی کلومنجڕ کەوتبووە سەری و ڕووناک و سارد بوو و کەندولەندی خیزەکان لەسەری دەدرەوشانەوە.

---

١- کورت نوێن. لە دەقەکەدا بە زمانی فەڕەنسی هاتووە.

سەربانی نارنجستان لە پشت دارەکانەوە دیاربوو و تەمێک لەو پەڕی شیوەکەوە هەڵدەستا و چڕتر دەبۆوە. دەوەنی یاسی بنەوش کە ئیتر گەڵایان پێوە نەمابوو هەتا سەر چڵووکەکەیان ڕووناک بوون. گوڵەکان بە شەونم خووسا بوون و بە جوانی لێک دەکرانەوە. لە ڕێگای نێوان دارەکاندا تاریک و ڕوون وەها تێک هاڵابوون کە دیمەنەکەی نە لە ڕێگا دەچوو نە لە دارستان، بەڵکوو لە ماڵی شەفاف و بریقەدار دەچوون کە دەجووڵان و دەلەرزینەوە. لەلای ڕاستەوە، لەبەر سێبەری دیوەخانەکە هەموو شتێک ڕەش بوو و دار و دەوەن و ڕێگا لێک نەدەکرانەوە و تاڕادەیەک ترسناک بوو. بەڵام چڵەپۆپەی پڕ لک و گەڵا و جوان و خەیاڵ بزوێنی چنارێک کە مەعلووم نەبوو بۆچی ئاوا نزیک، لەپاڵ دیوەخانەکە مابۆوە و لە تاریکییەوە بەرەو تریفە هەڵدەکشا و زۆر سەیر دەهاتە بەرچاو کە بەرەو ئاسمانی بێ سنوور هەڵنافڕێ و لە ڕەنگی کەهوویدا بزر نابێ.

گوتم: «وەرن با بچین پیاسەیەک بکەین!»

کاتیا ڕازی بوو بەڵام گوتی وا باشترە جزمە لەپێ بکەم.

گوتم: «پێویست ناکات کاتیا، سێرگی میخائیلیچ قۆڵم دەگرێ.»

دەتگوت قۆڵی ئەو ناهێڵێ ئاونگ لاقم تەڕ بکات! بەڵام لەو کاتەدا ئەم قسەیەی من بۆ هەر سێکمان سروشتی دەنواند و وەک شتێکی سەیر نەدەچوو. ئەو هیچ کات دەستی منی نەدەگرت. من خۆم قۆڵم دەخستە قۆڵی ئەو، بۆیە ئەو ئەم کارەی منی بە نائاسایی نەدەزانی. هەر سێکمان لەژێر ساباتەکە چووینە خوارێ. ئاسمان و باخ و هەوا و هەموو دنیا بۆ من لەگەڵ تەواوی ئەو شتانەی هەتا ئەو کاتە دەمناسی جیاوازیی هەبوو.

کاتێک بەرەو ڕووی خۆم، چاوم لەو ڕێگایە دەکرد کە بەسەریدا تێدەپەڕیین، دەتگوت ناتوانین لەوە زیاتر بچینە پێشێ و دنیای شتەکان هەر لەوێ کۆتایی پێ دێ و هەموو پاژەکانی سروشت لە جوانیی خۆیاندا چەقیان بەستووە و جووڵە ناکەن. لەگەڵ ئەوەشدا دەجووڵاین و بۆ پێشەوە دەڕۆیشتین. دیواری جادوویی شەو و جوانییەکانی دەقەڵەشایەوە و ئێمەی بۆ نێو خۆی بانگهێشتن دەکرد و ئەویش هەر وەک ئەو باخە ئاشنایە دەهاتە بەر چاو، درەختەکانی و شەقام وتوولەڕێ و گەڵای وەریو و ئێمە بە ڕاستی بەسەر ئەو ڕێگایەدا بەرەو پێشێ

دەچووین، پێمان لەسەر پەڵەی تاریکوڕوونی خاک دادەنا و گەڵای وشک لەژێر پێماندا خشپەی دەهات و لکە داری تەڕوبڕ بە گەڵای تەرچکەوە لە دەموچاومان دەدران، ئەو قۆڵی لە قۆڵمدا بوو و بە ڕاستی ڕێنوێنیی دەکردم و بە شێوەیەک ئارام و یەکهاوی هەنگاوی هەڵدێنایەوە و کاتیاش کە لەگەڵمان بوو کەوشەکانی سیڕەی دەهات، مانگە شەویش گرد و ڕووناک لە ژوور سەرمان بە تاقی ئاسمانەوە بوو و لەنێوان لک و پەلی بێ جووڵەی درەختەکانەوە تریفە بارانی دەکردین.

بەڵام دیوارێکی جادوویی لەگەڵ هەموو هەنگاوێکماندا لەپاش و پێشەوە ڕێگاکەی لێ دەتەنین و من باوەڕم نەدەکرد هەروا بتوانین بۆ پێشەوە بڕۆین، ئیتر بڕوام بە ڕاستیی هیچ شتێک نەبوو.

کاتیا لە ناکاو گوتی: «ئەیەڕۆ، قڕبۆق!»

لەدڵی خۆمدا گوتم: «کێ بوو ئەمەی گوت؟ بۆ؟» بۆشم دەرکەوت کە کاتیا بوو لەگەڵمان و لە بۆق دەترسا و چاوم لەبەر پێم کرد. بۆقێکی چکۆلانە بوو بازێکی دا و جووڵەی لە خۆی بڕی وەکوو سێبەرێکی کەمڕەنگ لەسەر قوڕە بریقەدارەکە مایەوە.

ئەو پرسیی: «ئێوە لە بۆق ناترسن؟»

من سەرم بۆ لای ئەو وەرسووڕاند. جێگای دارێک لە قەراغ ڕێگاکە خاڵی بوو و تریفەی مانگ دەموچاوی ڕووناک کردبۆوە. دەموچاوی زۆر جوان بوو و دیار بوو زۆر شیرین کامە...

پرسیبووی«ئێوە لە بۆق ناترسن؟» مانای ئەو وتەیەش لە گوێمدا ئەوە بوو کە «خۆشم دەوێی، کچە شیرینەکەم!» هەروەها نیگای و دەست گوشینەکەی "خۆشم دەوێی" دووپات دەکردەوە و ئەو پەیامەی لە پەڵەی ڕووناکی و نیسێکان و هەموو شتێکدا دووپات دەبۆوە.

دەوری باخەکەمان لێدا. کاتیا بە هەنگاوی ورد و خێرا لە تەنیشتمانەوە دەهات بەڵام ماندوو بووبوو و کەوتبووە هەناسە برکێ. گوتی کاتی ئەوەیە بگەڕێینەوە و منیش زۆر دڵم پێی سووتا. فەقیرە! لە دڵی خۆمدا دەمگوت: «ئاخر بۆچی نازانێ ئەوەی لە دڵمدایە هەستی پێ بکا؟ بۆچی هەمووان گەنج نین؟ بۆچی

هەمووان تامی ئەشق و بەکاوی دڵ گەیشتن ناچێژن؟ بۆچی هەمووان وەک ئەم شەو و وەک من و ئەو بەختەوەر نین؟»

گەڕاینەوە بۆ ماڵێ، بەڵام ئەو ماوەیەک لەوێ مایەوە، ئەگەرچی کەڵەشێر دەستیان بە خوێندن کردبوو و لە ماڵێدا هەمووان لە خەوێکی قووڵدا بوون و ئەسپەکەی ئەویش لەبەر پەنجێرەکە لە نێو گیاوگژەکاندا بەسترابۆوە زیاتر و زیاتر پڕمەپڕمی دەکرد و سمی لە زەوی دەکوتا. کاتیا وەبیری نەدەهێنایەوە کە درەنگ وەختە و ئێمەش بە قسە ئاسمان وڕێسمانمان لێک گرێ دەدا و وەها گەرم داهاتبووین و دڵخۆش بووین ئاگامان لە خۆمان و لە دنیا بڕابوو و بەو شێوەیە هەتا سەعات دووی دوای نیوەشەو دانیشتنەکەمان درێژەی کێشا. بۆ جاری سێهەم کەڵەباب خوێندی و کازیوە وڵاتی سپی داگێڕا کە ئەو ڕۆیشت. زۆر سادە و ئاسایی، وەک هەمیشە ماڵئاوایی کرد و بەبێ ئەوەی هیچ قسەیەک لە زاری هەڵفڕێ لێم دوور کەوتەوە. بەڵام من دەمزانی ئەو هی خۆمە و من ئیتر قەتی لە دەست نادەم و ئەشقی ژیان و بوونمە. کە بۆم دەرکەوت بە ڕاستی خۆشم دەوێ، کەوڵی دڵم لەلای کاتیا کردەوە. ئەو زۆری پێخۆش بوو و ئەو درکاندنی نیهێنییەی من خۆشحاڵی کرد. فەقیرە ئەو شەوە بە ئاسوودەیی خەوت، بەڵام من ماوەیەکی زۆر لەبەر ساباتەکە ڕاوەستام و چوومە نێو باخەکە پیاسەم کرد. ئەو وشانەی ئەو بەسەر زاریدا هاتبوو و هەموو جووڵە و هەڵسوکەوتەکانیم وەبیر خۆم دەهێنایەوە و بەو ڕێگایانەدا دەگەڕامەوە کە لەگەڵ ئەودا پێیدا ڕۆیشتبووم. هەتا بەیانی بەخەبەر مامەوە و بۆ یەکەم جار هەڵاتنی خۆرم دی و بەرەبەیانم بە وشیارییەوە ڕابوارد، دوای ئەوە لە تەواوی ماوەی تەمەنمدا نە شەوێکی ئاوام دیتەوە و نە گزنگ و بەیانێکی لەو جۆرە. لە دڵی خۆمدا گوتم: «بەڵام نازانم بۆ زۆر سادە و ئاسایی ناڵێ خۆشی دەوێم؟ خودا دەزانێ چ کێشە و گرفتێک لە هیچوپووچ تێک هەڵدەکێشێ و خۆی بە پیر دەزانێ، کەچی دەبینین هەموو شتێک ئاوا ساکار و جوانە! بۆچی دەرفەتی ئاوا کە ڕەنگە جارێکی تر هەڵنەکەوێتەوە بە فیڕۆ دەدا؟ ئاخر بڵێ"خۆشم دەوێی!" بە زمان بیدرکێنە! دەستم بگرە، سەرت لەسەر دەستم دانەوێنە و بڵێ خۆشم دەوێی! خۆ ئاسمان ناڕووخێ! سوور هەڵگەڕێ، شەرمنانە لەهەمبەرمدا سەرت داخە و ئەو کاتە منیش هەموو شتێک

دەڵێم. یان هیچ ناڵێم، بەڵکوو لە ئامێزت دەگرم و دەتگوشم بە خۆمەوە و لەگەڵ تۆ دەبمە یەک، دەبین بە گیانێک لە دوو جەستەدا، ئەمجار سەرم دەنێم بە سنگتەوە و دەگریم» هەر لەناکاویش گومانێک دڵی داگرتم کە «ئێستا ئەگەر بە هەڵە چووبێتم؟ ئەگەر خۆشی نەوێم چی؟»

ئەو هەستە ترسێکی تاڵی خستە دڵمەوە. خودا دەزانێ ئەو گومان و دڕدۆنگییە بەرەو کوێ پەلکێشم دەکات! پەشۆکاویی ئەو و خۆمم وەبیر هێنایەوە کاتێک بەسەر دیواری باخەکەدا بازم دا و چووم بۆ لای. خەمێکیش نیشتە دڵم و بێ ئیختیار فرمێسک بە ڕوومەتمدا هاتە خوارێ و پەنام بۆ خودا برد، دوای ئەوە بیرێکی ئازارشکێن لە سەرمدا هەڵقوڵی و هیوای خستە دڵمەوە. بڕیارم دا کە ببمە خۆپارێز و ڕۆژوو بگرم و ڕۆژی لە دایک بوونم بچم بۆ کلێسە و لە دڵی خۆمدا شووی پێ بکەم و ببم بە بووک.

بۆ؟ چۆن؟ ئەو حاڵەتە چۆن دێتە پێشێ؟ تێناگەم. بەڵام هەر لەو ساتەوە دەمزانی، لێم ڕوون بوو کە هەروا دەبێ. خۆر بە تەواوی هاتبووە سەرێ و هەموو خەریک بوون لە خەو هەستن کە من چوومە نێو ژوورەکەی خۆم.

## چوار

سەروبەندی ڕووژووی مێعراجی مریەم بوو و هەر بەو هۆیە هیچ کام لە کەسانی ماڵێ ئەو ڕۆژوو گرتنەی منیان بەلاوە سەیر نەبوو.

لە ماوەی ئەو حەوتووەدا ئەو بۆ جارێکیش نەهات بۆ سەردانمان و من نەک پێم سەیر نەبوو و نیگەرانی و خەمی ئەوم لە دڵدا کۆ نەکردەوە و لێی دڵمەند نەبووم، بەڵکوو دڵخۆشیش بووم کە ئەگەر ئێستا نەیەت ڕۆژی لە دایکبوونم بە دڵنیاییەوە دێت. لەم حەوتووەدا هەموو ڕۆژێک زووتر لە کاتی ئاسایی لە خەو هەڵدەستام و هەتا ئەسپەکەیان بۆ لە فایتوون دەکردم، بە تەنیا لە نێو باخەکەدا پیاسەم دەکرد و ئەو کارە خراپانەی کە ڕۆژی ڕابردوو کردبوومن وەبیر خۆمم دەهێنانەوە و بیرم دەکردەوە دەبێ چبکەم بۆ ئەوەی شەوێ بە ئارامی سەر

بنێمە سەر سەرین و ئازاری ویژدانم نەبێ و تەنانەت بۆ جارێکیش تووشی هەڵە نەبم و کارێکی نەشیاو ئەنجام نەدەم. لەو ڕۆژانەدا ژیانی بەبێ تاوان و هەڵەم بە کارێکی زۆر ئاسان دەزانی و پێموابوو تەنیا تۆزێک هەوڵ و خۆپارێزی تەواوە و دەبم بە ئاوی شەوێ. کاتێک فایتوونەکەیان دەهێنا من لەگەڵ کاتیا، یان ئەگەر ئەو لە هەوێڵدا نەبوایە لەگەڵ یەکێکی تر لە خزمەتکاران سوار دەبووم و دەچووم بۆ کلێسە کە نزیکەی سێ وێرست مەودای هەبوو. کاتێک دەگەیشتمە کلێسە، هەموو جارێک وەبیرم دەهاتەوە کە دەبێ دۆعا بۆ هەموو ئەو کەسانە بکەم کە بە«دڵێکی پڕ لە پاکی و خودا پەرستییەوە» دێنە نێو کلیسا و هەوڵم دەدا هەر بەو هەستەوە لە پلیکانی چیمەنپۆشی هەرێمی کلێسەوە سەرکەوم و بچمە ژووریێ. نزیکەی دە ـ دوازدە ڕەعیەت و خزمەتکاری بە ڕۆژوو لە کلێسە دەبوون و من هەوڵم دەدا بەو خاکەڕاییەوە کە بەسەر خۆمدا سەپاندبوو وەڵامی کڕنۆشی ئەوان بدەمەوە و خۆم دەچووم بۆ لای قوتووی مۆمەکان و مۆمم لە سەربازە پیرە مۆمدارەکە دەکڕی و هەڵمدەکرد و ئەو کارەم بەو پەڕی خاکەڕایی و خۆبەکەم گرتن دەزانی. لە نێو دەرگانەیەکەوە کە وێنەی پیرۆز و مێزی پەرستگەی لە کلێسە جیا دەکردەوە شاڵی گوڵدۆزی کراوی سەر مێزەکەم دەدی کە دایکم پێشکەش بە کلێسەی کردبوو و لەسەر ڕەفحەی بەر پێی وێنەی پیرۆز دوو پەیکەرەی دارین سەرنجیان بۆ لای خۆیان ڕادەکێشام. دوو فریشتە بوون بە ئەستێرەوە و من بە منداڵی ئەو دوو فریشتەیەم زۆر پێ گەورە بوو، هەروەها کۆترێک بە خەرمانەی زێڕینەوە، کە لە ڕابردوودا زۆرم حەز لێی بوو. لە پشت شوێنی کۆڕی سروودەوە لەگەنێکی کۆنە و قوپاو سەرنجی ڕاکێشام کە منیان لە نێو ئەودا سەرانشۆ دابوو و خۆشم وەک دایەخێوی منداڵی خزمەتکارەکەمان لە لای بووم کە سەرانشۆیان دا. قەشەی بە ساڵاچوو بە عەبایەکەوە کە لە شاڵی تابووتەکەی باوکم ئامادە کرابوو لە دیوی جلان هاتە دەرێ و ڕێوڕەسمی عیشای ڕەببانیی هەر بەو دەنگ و لەبزەوە بەڕێوە برد کە لەو کاتەوە فامم کردۆتەوە لە هەموو ڕێوڕەسمە پیرۆزەکانی ماڵیدا بیستبووم: لە کاتی سەرانشۆی سۆنیا دا و لە ڕێوڕەسمی یادمانی باوکمدا و لە پرسە و بە خاک سپاردنی دایکمدا. دەنگی لەرزۆکی جانکوشی کلێسە لە نێو پانتایی پەرستگەدا بوو بە زایەڵە و پیرێژنێک

که هەمیشه له هەموو عیشای ڕەببانییەکاندا له کلیسا بوو له پاڵ دیوارەکەدا خۆی ڕاست کردبۆوە و بە چاوانی پڕ لە فرمێسکەوە چاوی لە وێنەی پیرۆز بڕیبوو و قامکە لێک هەڵپێکراوەکانی بە نیشانەی پاڕانەوە بە لکەی ڕیشکۆداری لەچکە ڕەنگ بواردووەکەیەوە دەگوشی و زارە بێ ددانەکەی دەجووڵاند و دۆعایەکی دەخوێند. ئەمانە ئیتر بابەتی وردبینی و یاد و بیرەوەرییەکانم نەبوون. بەڵکوو لەبەر چاوم مەزنایەتییەکی ڕووحانیی هەبوو و پیرۆز و هەڵگری مانایەکی زۆر قووڵ بوو. من گوێم بۆ وشەبەوشەی ئەو دۆعا و پاڕانەوانە ئەوێ ڕادەگرت و هەوڵم دەدا هەستی دڵم لەگەڵ ئەوان سازگار بکەم و پاک و خالیسانە هەموویان دووپات بکەمەوە و لەهەر جێیەکدا لە ماناکەی تێ نەدەگەیشتم داوام لە خودا دەکرد دڵم بە حەقیقەتی ئەوان ڕووناک بکاتەوە و لەهەر کوێیەکدا لە وشەی دۆعاکان حاڵی نەبوایەم و بە جوانی نەمبیستایە دۆعایەکی خۆکردم لە جێگای دادەنا و کاتێک دۆعای پەژیوانی دەخوێندرایەوە ڕابرووی خۆمم وەبیر دەهاتەوە ڕابردووی پاکی منداڵیمم لەهەمبەر سەفای ڕۆحم لەو کاتەدا هێندە ڕەش دەهاتە بەر چاو کە فرمێسک بە چامدا دەهاتە خوارێ و لە ترسانا سەرتاپای گیانم دەلەرزی. لەگەڵ ئەوەشدا هەستم دەکرد ئەو تاوانانە دەبەخشرێن و تەنانەت ئەگەر تاوان و کردەوەی ناحەزتریش لەسەر ڕۆحم قورسایی بکات پەژیوان بوونەوە لەوان بۆم شیرینتر دەبێ. کاتێک قەشە لە کۆتایی دۆعاکانیدا گوتی: «ڕەحمەتی خوداتان لێ بێ!» هەستم کرد لەڕێوە ئاسوودەییەکی جەستەیی ئۆخژنی پێ بەخشیم. وەک ئەوەی لەناکاو ڕووناکی و گەرمییەکی ڕازاوی و شیرین دڵی پڕشنگ باران کردبێتم. ڕێوڕەسمی عیشای ڕەببانی کۆتایی هات و قەشە لێم نزیک بۆوە و پرسیی حەز دەکەم بۆ بەجێ هێنانی عیشای تایبەت بێت بۆ ماڵمان و هەر کاتێکیش بۆ ئێمە گونجاوتر بێ ئەو کاتە دێ. من زۆر کەوتمە ژێر کاریگەری سۆز و خۆشەویستیی ئەو و سپاسم لێکرد کە ئاوا لە بیری ئێمەدایە و چاکەمان لەگەڵ دەکات و گوتم ڕازی بە زەحمەتی ئێوە نیم و خۆم دێم بۆ کلێسە.

گوتی: «حەز دەکەی خۆت تەشریف بێنی؟ ئەو هاتنە بەلاتەوە دژوار نییە؟

منیش نەمدەزانی چ وەڵامێکی بدەمەوە کە تووشی تاوانی هەوا و دەمارزلی نەبم.

دوای عیشای ڕەببانی هەمیشە فایتوونەکەم دەناردەوە و ئەگەر کاتیام لەگەڵ بووایە بە پێیان دەگەڕاینەوە و کاتێک تووشی ڕێبواران دەبووم خاکەڕایانە کڕنۆشم بۆ دەبردن و هەوڵم دەدا دەرفەتێکم بۆ هەڵکەوێ کە هەرکەس پێویستی بە یارمەتی بێ، یارمەتیی بدەم یان ڕێنماییی بکەم یان ئەگەر پێویست بایە فیداکاریی بۆ بکەم. ئەگەر عارەبانەیەک وەرگەڕابێ بۆ هەستانەوەی یارمەتییان بدەم، یان لانکەی کۆرپەیەکی گریاو ڕاژێنم تاکوو ژێر بێتەوە. یان کاتێک بە باریکە ڕێیەکەدا دەڕۆیشتم ئامادە بووم لادەم بۆ نێو قوڕوچڵپاو تاکوو ڕێبوارەکەی کە بەرەو ڕووم دەهات بەسەر ڕاستە ڕێگاکەدا بڕوات. شەوێکیان گوێم لێبوو گزیرەکەمان بە کاتیای دەگوت کە یەکێک لە مووژیکەکانی ئێمە کە ناوی سمیۆن بوو، هاتووە داوای تەختەیەک دەکات بۆ تابووتی کچەکەی و هەوەها ڕۆبڵێکی بە قەرز دەوێ تاکوو بۆ خوێندنی دۆعای مردوو و تەڵقین و ناشتن بیدات بە قەشە. من پرسیم: «بۆ؟ مەگین دەستەنگە؟» گزیر لە وەڵامدا گوتی: «بەڵێ، زۆر هەژارە. بە جۆرێک کە شەوانە خۆی و منداڵەکانی بە برسییەتی سەر دەنێنەوە!» وەک ئەوە وابوو چاڵووکێک بکەن بە دڵمدا. لەگەڵ ئەوەشدا دەتگوت بیستنی ئەو هەواڵە شادی کردووم. کاتیام فریودا و گوتم دەمەوێ تۆزێک پیاسە بکەم و هەڵاتم بۆ ژوورەکەم و ئەوەی پارەی هەمبوو هەڵم گرت(هەڵبەت شتێکی وانەبوو بەڵام هەموو دارونەدارم بوو) خاچی خۆم کێشا و لەبەر هەیوانەکە چوومە خوارێ و لە نێو باخەکەوە خۆم گەیاندە گوندەکە و چووم بۆ ماڵی سمیۆن، کە لە شوێنێکی لاپەڕ هەڵکەوتبوو، بە جۆرێک کە هیچ کەس نەمبینێ چوومە پشت پەنجەرەی ماڵەکەی، پارەکەم لەسەر لێواری پەنجەرەکە دانا و بە قامک لە پەنجەرەکەم دا و هەڵاتم. دەنگی کرانەوەی دەرگای ماڵەکەی هات و کەسێک هاتە دەرێ، بانگی کردم بەڵام من لە ترسانا ئەژنۆم لەرزی. وەکوو تاوانبارێک خۆم گەیاندەوە ماڵێ و سەرتاپای گیانم وەک سەهۆڵی لێ هات. کاتیا پرسیی لە کوێ بووی و چی ڕووی داوە، بەڵام من تەنانەت لە پرسیارەکەشی تێنەگەیشتم و وەڵامم نەدایەوە. لەناکاو هەموو شتێک لەبەر چاوم زۆر سووک و بێ بایەخ بوون و بێزم لە ماڵ و سامان و ژیان هەستا. خۆم کرد بە ژوورەکەمدا و دەرگام لەسەر خۆم داخشت و ماوەیەک لە نێو ژوورەکەدا هاتم

و چووم. هێندە شێوا بووم کە لە هەموو کار و بیرکردنەوەیەک عاجز بووم و سەرم لەو هەستەی خۆم دەرنەدەچوو. بیرم لە شادیی دانیشتووانی ئەو ماڵە دەکردەوە کە ڕەنگە سەبارەت بەو کەسەی ئەو پارەیەی لەبەر پەنجەرەکەیان داناوە قسە بکەن، لە لایەکیشەوە داخم لێ دەهات کە بۆچی بە دەستی خۆم پارەکەم پێ نەدان. بیرم لەوە دەکردەوە ئەگەر سێرگی میخائیلیچ ئەو شتە ببیستێ چی دەڵێ و زۆریش خۆشحاڵ بووم کە هیچ کەس قەت لەو کارەی من ئاگادار نابێ و هەمووان، یەک لەوان خۆشم هێندە لاواز و خەتابار دەهاتە بەر چاو و دەرهەق بە خۆم و هەمووان خۆشەویستییەکی وا لە دڵم هەڵدەقووڵی کە بیری مەرگ بۆم بوو بە خولیای بەختەوەری. پێدەکەنیم و دۆعام دەکرد و دەگریام و سەبارەت بە هەموو عالەم و هەوەها خۆشم ئەشقێکی گەرم و ئاگرین لە دڵمدا سەری هەڵدا. لە نێوان دوو عیشای ڕەببانیدا لە کلیسا ئینجیلم دەخوێندەوە و باشتر و باشتر لەو کتێبە دەگەیشتم و چیرۆکی ژیانی پاک و خودایی شرۆڤە کراو لەودا بەلامەوە دڵگرتر و سادەتر دەبوو و قووڵاییی ئەندێشە و هەستم لەگەڵ خوێندنەوەی ئەو کتێبە سەر سووڕهێنەرتر و ڕازاوی تر دەبوو. بەڵام لەلایەکی ترەوە، کاتێک سەرم لەسەر هەڵدەگرت و بیرم لە ژیان و ئەو شتانە دەکردەوە کە لە دەوروبەری خۆم دەمدی، دیسان هەموو شتێک لەبەر چاوم ڕووناک و سادەی دەنواند. بۆم دەرکەوت کە خراپەکاری چەندە دژوارە و خۆشویستنی خەڵک چەندە سانایە و چەندە خۆشە هەموو کەس خۆشی بووێ و ڕێزت بۆ دانێ. چەندە خۆش دەبوو کە هەمووان بەنەرمی لەگەڵم بجووڵێنەوە و مێهرەبان بن. تەنانەت سۆنیاش، کە من دەرسم پێ دەگوت گۆڕا بوو و هەوڵی دەدا باشتر دەرس بخوێنێ و فێربێ و من لێی ناڕازی نەبم و ڕقم لێی هەڵنەستێ. هەمووان هەڵسوکەوتیان لەگەڵ من جۆرێک بوو کە من لەگەڵ ئەوان. کاتێک دەبوو بەر لە چوون بۆ کلێسە و تۆبە کردن و دانپیانان بچم بۆ لای دوژمنانی خۆم کە گەردن ئازاییان لێ بخوازم، هەرچی مێشکی خۆم هەڵدەگوشی و دەمهێنا و دەمبرد لە دەرەوەی ماڵێ جگە لە کچێکی جیرانمان هیچ کەسم بە زەین نەدەگەیشت، ئەویش لەمەو بەر لەبەر چاوی خەڵک پێی پێکەنیبووم و ئەو ئیتر لەو کاتەوە سەری نەکردبوو بە ماڵماندا. نامەیەکم بۆ ئەو کچە نووسی و لەوێدا

دادنم پێدانا کە تاوانبارم و بە هۆی ئەو کارە ناحەزەمەوە داوای لێبوردنم لێکرد. لە وەڵامی مندا نامەیەکی نووسیبوو و لەودا ئەو خۆی داوای لێبوردنی لە من کردبوو و تاوانی منی بەخشیبوو و گەردەنی ئازاد کردبووم. من کاتێک ئەو چەند دێرە ساکارەم خوێندەوە کە هەڵگری هەستێکی قووڵ و شیرین بوون هێندە خۆشحاڵ بووم کەدەستم کرد بە گریان. دایەنەکەشم کاتێک داوای لێبوردنم لەو کچە دەکرد فرمێسک بە چاویدا دەهاتە خوارێ. لە دڵی خۆمدا دەمگوت: «ئەوانە بۆچی دەرهەق بە من ئاوا مێهرەبان و دڵنەرمن؟ من چیم کردووە کە شایانی ئەو ڕێز و خۆشەویستییە بم؟!» بێ ئیختیار سێرگی میخائیلیچم وەبیر دەهاتەوە و یادی تا ماوەیەکی زۆر لە مێشکم نەدەچووە دەرێ. جگە لەوە چارەیەکم نەبوو و تەنانەت لەو کارەدا شتێکی خراپم نەدەدی. بەڵام ئێستا بە هیچ شێوەیەک وەک ئەو شەوەی بۆ یەکەم جار زانیبووم خۆشم دەوێ بیرم لێ نەکردەوە، بەڵکوو بێ ئیختیار ئەوم لەگەڵ هەموو بیرێک پێوەندی دەدا کە داهاتوومی دەگرتەوە و لە هەموو گەڵاڵەیەکدا کە بۆ ژیانم دادەڕشت ئەوم دەکردە هاوبەش. ناخۆشییەک کە لە ڕابردوودا شوێنی لەسەر دانابووم لە دڵم سڕدرایەوە. ئێستا خۆم لەگەڵ ئەو بە یەکسان دەزانی و لەو بەرزاییەوە کە ڕۆحم دەستی پێی ڕاگەیشتبوو، زۆر بە باشی لە حاڵوباڵی ئەو تێدەگەیشتم. ئەوەی پێشتر لە هەڵسوکەوتی ئەودا دەمدی و پێم سەیر بوو ئێستا بۆم ڕوون بووبۆوە. ئێستا بۆم دەردەکەوت کە ئەو کاتەی گوتبووی«مرۆڤ کاتێک بەختەوەرە کە بۆ کەسێکی تر بژی» مەبەستی چی بووە و بە تەواوی لەگەڵی هاوڕا بووم. پێموابوو من و ئەو دەستمان بە ئاشتی و سەفا و بەختەوەرییەکی بێ پایان ڕادەگا. ئیتر بیرم لە سەفەری هەندەران یان هاتوچۆی گەوران و کۆڕوکۆبونەوەی گەورە و بریقوباقی ژیانی زەنگینانە نەدەکردوە. ئێستا ئاواتی دیکەم هەبوو، ئاوتی ژیانێکی هێمن و ڕووناکیی بنەماڵە لە گوند و گیانفیدایی و ئەشقی هەمیشەیی هاوڕێ لەگەڵ شوکرانە و ڕێز کە لێوڕێژ بوو لە شادی و پاکی و مێهرەبانی.

هەروەک بڕیارم دابوو ساڵڕۆژی لە دایکبوونم چووم بۆ کلێسە بۆ تازە کردنەوەی پەیمان لەگەڵ خودا. کاتێک لە کلێسە دەگەڕامەوە شادی و بەختەوەرییەکی بێگەرد لە دڵمدا بوو کە لە ژیان دەترسام و لە هەر هۆکارێک کە

لەوانەیە شوێنێکی تر لەسەر دڵم دانێ و بەختەوەریم زایە بکات. بەڵام هەر لەگەڵ لە فایتووکە دابەزیم لە قاڵدرمەکانی سابات وەسەر کەوتم دەنگی ئاشنای فایتوونێکم بیست کە بەسەر پردەکەدا تێدەپەڕی و کە ئاوڕم دایەوە چاوم بە سێرگی میخائیلیچ کەوت. ئەو هاتبوو پیرۆزبایی ساڵرۆژی لە دایک بوونم پێ بڵێت و پێکەوە چووین بۆ ژووری میوانداری. لەو کاتەوە ئەوم دەناسی قەت بە ڕادەی ئێستا لە هەنتەشیدا هەستم بە ئاسوودەیی نەکردبوو و بەسەر خۆمدا زاڵ نەبووبووم. دنیایەکی نوێ لە دڵمدا پێک هاتبوو کە ئەو دەستی پێی ڕانەدەگەیشت. دنیایەک بوو لەو پەڕی تێگەیشتنی ئەو. لە ئاخافتندا شەرمم لێ نەدەکرد. پێموابێ هۆی ئەو حاڵە تازەیەمی بۆ دەرکەوت و زیاتر لە کاتی ئاسایی لەگەڵم نەرم و مێهرەبانانە ڕەفتاری کرد و ڕێزگرتنەکەی ڕەنگێکی ڕۆحانیی بەخۆوە گرت. من چووم بۆ لای پیانۆکە بەڵام ئەو دەرگاکەی داخست و کلیلەکەی نایە گیرفانی.

گوتی: «ئەم حاڵەی خۆت بە مۆسیقا مەفەوتێنە. مۆسیقای حاکم لە دڵی ئێوەدا لەم کاتەدا هێندە جوانە کە دڵنەوازترین ئاهەنگەکانی دنیا پێی ناگا.»

من زۆرم ئەو قسەیەی بە دڵ بوو و لەگەڵ ئەوەشدا هێندێک ناڕەحەت بووم چونکە دیتم ئەو ئاوا بە ئاسانی لە ڕازی دڵم تێ گەیشت کە دەمویست لە هەمووانی بشارمەوە و ئەو ئاوا بە ڕوونی لاپەڕەی ناخمی خوێندەوە. کاتی نان خواردنی نیوەڕۆ گوتی بۆ ئەوە هاتووە پیرۆزبایی ساڵرۆژی لە دایکبوونم پێ بڵێ و هەروەها خوداحافیزیم لێ بکات کە ڕۆژی دوایی دەچێ بۆ مۆسکۆ. کە ئەو قسەیەی دەکرد لە کاتیای دەڕوانی، بەڵام دواتر بە دزییەوە چاوێکی لەمن کرد و تێگەیشتم کە دەترسێ ئاسەواری گۆڕان لە ڕوخسارمدا ببینێ. بەڵام من لەو هەواڵە واقم وڕنەما و تووشی هەیەجان نەبووم و تەنانەت لێشم نەپرسی کە سەفەرەکەی زۆر دەخایێنێ یان نا. ئەمڕۆ گێڕانەوەی ئەو حاڵەم زۆر بەلاوە دژوارە بەڵام ئەو ڕۆژە لە پێشدا دەمزانی ئەو هەواڵەم پێدەدا و هەروەها دەشمزانی کە ناچێ بۆ سەفەر. بەڵام پێموابوو لە خەوێکی شیریندام و ئەوەی لە داهاتوودا ڕوودەدا، ڕووی داوە و من ماوەیەکی درێژە کە لێی ئاگادارم و ئاشنایە بۆم و لە داهاتوودا جارێکی تر ڕوودەداتەوە و من دەزانم کە ڕوو دەدات.

ئەو دەیویست لە دوای نەهار بەبێ ڕاوەستان بڕوا بەڵام کاتیا کلیسا شەکەتی کردبوو چوو سەرخەوێک بشکێنێ و سێرگی میخائیلیچ ناچار بوو هەتا کاتیا لە خەو هەڵدەستێ لەوێ بمێنێتەوە و ماڵئاوایی لێ بکات. خۆر لە نێو ژوورەکەی دابوو و ئێمە چووین بۆ ژێر ساباتەکە. هەر کە دانیشتین من زۆر بە ئارامی دەستم کرد بە قسە کردن و شتێکم گوت کە دەبوو چارەنووسی ئەشقم دیاری بکات و هەرکە دانیشتین دەستم پێکرد، نە تۆزێ زووتر نە درەنگ تر، بۆ ئەوەی هیچ قسەیەک نەکرێ کە باسەکە بە لاڕێدا بکێشێ و ببێتە بەربەستێک لەسەر ڕێی ئەو قسانەدا کە دەمەوێ بیکەم. خۆشم تێناگەم کە ئەم هیمنایەتی و لێبڕانە و لەبزی ڕاشکاوانەی من لە کوێوە هاتبوو. دەتگوت شتێکی ئازاد لە ئیرادەی من لە زمانی منەوە قسە دەکا. ئەو بەرانبەرم دانیشتبوو و هەنیشکی لەسەر محەجەرەکە دانابوو و لقێکی یاسی بنەوش کێشابووە پێشێ و پەلکەکانی دانەدانە لێدەکردەوە. کاتێک من دەستم کرد بە قسە کردن ئەو لقەکەی بەردا و هەنیشکی لەسەر مێزەکە دانا و سەری کردە سەر لەپی دەستی. ئەو حاڵەتە لەوانە بوو حاڵەتی کەسێکی تەواو بێ خەیاڵ یان زۆر پەشۆکاو بێ.

من ڕاست چاوم لە چاوی بڕی و بە لەبزێکی مانادار و وشەی دانار دانار لێم پرسی: «بۆ دەڕۆی؟»

ئەو دوای گت گرنێک سەری داخست و وەڵامی دایەوە: «دەچم بە دوای کاروبارەکانمدا!»

من دیتم ناتوانێ بۆ وەڵامی پرسیارێکی ئاوا خۆمانە، کە چاوی لە چاوم بڕیبێ درۆ بکات. گوتم: «بڕوانە، ئێوە زۆر باش دەزانن کە ئەمڕۆ بۆ من چ ڕۆژێکە. ئەوڕۆ بە زۆر هۆکاری جۆراوجۆر بۆ من زۆر گرینگ و خۆشەویستە. ئەگەر ئەو پرسیارە لە ئێوە دەکەم لەبەر ئەوە نییە کە وابنوێنم هۆگریم بە کارەکانتانە (ئێوە دەزانن کە خووم پێگرتوون و خۆشم دەوێن!) ئەگەر دەپرسم بۆ ئەوەیە بە ڕاستی دەمەوێ ڕاستییەکەی بزانم و هەر دەبێ بیشیزانم. بۆچی دەڕۆن؟»

گوتی: «گوتنی هۆکاری ڕاستەقینە بۆ من زۆر دژوارە. لە حەوتووی ڕابردوودا من زۆرم بیر لە ئێوە و خۆم کردەوە و ئاکامی ئەو بیرکردنەوانە ئەمە بوو کە بۆم

دەرکەوت دەبێ بڕۆم. ئێوە دەزانن بۆ چی و ئەگەر منتان خۆش دەوێ ئیتر پرسیارم لێ مەکەن.»

دەستێکی بە نێوچاونیدا هێنا و چاوی قووچاند و درێژەی پێدا: «وەڵام دانەوەی پرسیارەکەی ئێوە زۆر دژوارە بۆم و ئێوەش زۆر باش دەزانن بۆ!»

دڵم کەوتە کوتەکوت و خۆی دەکێشا بە سینگمدا.

گوتم: «ناتوانم تێبگەم. **ناتوانم**. بەڵام **ئێوە** پێم بڵێن، تۆ ئەو خودایەی دەیپەرستی، تۆ ئەو ڕۆژەی کە بە ئاواتەوەم پیرۆز و موبارەک بێ، پێم بڵێن. من دەتوانم هەرچی بیڵێن بە ئارامی گوێی بۆ شل بکەم.» باری دانیشتنەکەی گۆڕی، چاوێکی لە چاوم کرد و دیسان لقێکی یاسی بنەوش کێشایە پێشێ.

دوای گت گرتنێکی کورت، بە دەنگێک کە بێهوودە هەوڵی دەدا ئارام و ئاسایی بنوێنێ گوتی: «باشە، ئەگەرچی ئەو کارە گەوجانەیە و وێناچێ هەستی خۆم بە وشە دەرببڕم، ئەگەرچی ئەو کارەش بۆ من زۆر دژوارە هەوڵ دەدەم وەڵامتان بدەمەوە.» پاشان وەک ئەوەی بە هۆی ژانێکی جەستەییەوە، خۆی گرژ بکات، نێوچاوانی تێک نا.

گوتم: «دەی؟»

گوتی: «وای دانێن کە پیاوێک هەبوو، ناوی دەنێین "ئەلف"، بە ساڵاچوو و دڵمردوو، کچێکی جوانیش، بڵێین خانمی "ب"، کە گەنج و بەختەوەر بوو. نە لە نێو خەڵکدا ژیابوو و ئەزموونی داب و نەریتەکانی ئەوانی هەبوو و نە شتێکی لە باری ژیانەوە دەزانی. بارودۆخی بنەماڵە جۆرێک بوو کە "ئەلف" ئاشقی ئەو کچە جوانە بوو، وەکوو کچی خۆی و هیچ دڵنگەرانییەکی نەبوو کە هۆگرییەکەی بۆ ئەو ڕەنگێکی تر بەخۆوە بگرێ.»

بێدەنگ بوو بەڵام من هەودای وتەکانیم نەپچڕاند.

پاشان بە دەنگێکی خێراتر و بە لەبزێکی لێبڕاوانە، بێ ئەوەی چاو لە چاوم بکات درێژەی پێدا: «بەڵام "ئەلف" لەبیری چووبوو کە کچە زۆر گەنجە و ژیان بۆ ئەو وەک یاری وایە و لەوانەیە بە ئاسانی هۆگریی ئەو تووشی گۆڕان بێ و ئەگەر بگۆڕێ کچە هەر وەک یارییەکی تازە پێشوازیی لێدەکات. بەڵام لەوە خافڵ بوو کە لەناکاو هەستێکی تر، تاڵ و دژوار، قورس وەک پەشیمانی خۆ لە دڵی

دەهاڵێنێ و ئەو حاڵەتە ترس دەشکێنێتە گیانی. ترسەکەشی ئەوە بوو کە پێوەندیی دۆستانەی پێشوویان دەپچڕێ و زایە دەبێ. بۆیە بڕیار دەدا بەر لەو فەوتان و تێداچوونە لێی دوور بکەوێتەوە.» ئەوەی گوت و دیسان وای نواند کە لەخۆوەیە و چاوانی قووچاند و دەستێکی پێدا هێنان.

من بەسەر پەشۆکاویی خۆمدا زاڵ بووم و بە دەنگێک کە دەتگوت لە ناخی بیرێکەوە دێتە دەرێ پرسیم: «بۆ لەوەی ئەشقەکەی ڕەنگێکی تربەخۆوە دەگرێ تووشی ترس دەبێت؟» دەنگم ئەگەرچی لەسەرەخۆ و لەبزم ئارام بوو بەڵام ڕەنگە ئەو پێی وابوو تانە و توانجی پێوە بووە. چونکە بە لەبزێکی زویرانە وەڵامی دایەوە:

«"ئێوە گەنجن، بەڵام من ئیتر لاو نیم. ئێوە دەتانەوێ یاری بکەن، من ئیتر تاقەتی یاریم نییە. یاریی خۆتان بکەن، بەڵام نەک لەگەڵ من. دەنا من بڕوا بە قسەکانی ئێوە دەکەم و ئەو کاتە ئیتر من هاوارە لە خۆم. قوڕم بەسەردا دەکرێ و ئێوەش پەشیمان!" ئەمانە قسەیەک بوون کە "ئەلف" بۆ "ب"ی درکاند. چاکە ئەوانە هەمووی قسەی هەڵیت پڵیتە. بەڵام ئێوە دەزانن من بۆچی دەمهەوێ بڕۆم. وەرە با ئەو باسە ببڕینەوە. تکات لێدەکەم!»

من بە دەنگێک کە ئۆناق و گریان بەری گرتبوو گوتم: «نا، نا! نایبڕینەوە! پێم بڵێ با تێبگەم. "ئەلف" "ب"ی خۆش دەویست یان نا؟»

ئەو وەڵامی نەدایەوە.

من گوتم: «ئەگەر خۆشی نەدەویست بۆچی بە هیوای کردبوو؟» بەپەلە قسەکەی پێ بڕیم «بەڵێ، بەڵێ، داوای لێبوردن دەکات! کارەکەی هەڵە بوو. بەڵام چاکە، بەخێر گوزەرا و لێک جیا بوونەوە، بە باشی و بە خۆشی!»

بە هەوڵێکی زۆر توانیم دەنگم لە سینگم دەرکێشم و گوتم: «چۆن بە باشی و بە خۆشی؟ چی لەوە ترسناکترە؟ یانی هیچ ڕێگە چارەیەکی تر نەبوو؟» ئەوەم گوت و وتەکەی خۆم تووشی ترسێکی کردم کە لەرزی شکاندە گیانم.

دەستی لەسەر ڕوخساری لابرد کە بە هۆی پەشۆکاوییەوە سپی هەڵگەڕا بوو، ڕاست چاوی لە چاوم بڕی و گوتی: «چۆن نەبوو؟ ڕێگە چارە دوودانە بوون. بەڵام تۆ خودا لێم گەڕێ با قسەکەم بکەم و هەوڵ بدە ددان بە خۆتا بگری و لێم

تێبگەی» هەستا و بە بزەیەکی خەماوییەوە کە دنیایەک خەمی لێ دەباری درێژەی بە قسەکانی دا: «هێندێ کەس دەڵێن "ئەلف" شێتیی نواند و عاشقی "ب"بوو و هەگبەی دڵی خۆی بۆ هەڵڕشت و "ب" تەنیا پێی پێکەنی. ئاخر بۆ ئەو ماجەراکە تەنیا گاڵتەیەک بوو و بەس. بەڵام بۆ "ئەلف" باس باسی ژیان بوو و فەوتان و تێدا چوون لەگۆڕێدا بوو.»

من لەرزیم و دەمویست دیسان بپەڕمە نێو قسەکانی و بڵێم چۆن دەوێرێ قسەیەکی ئاوا بە زاریدا بێ، بەڵام ئەو دەستی لەسەر دەستم دانا و نەیهێشت دەمم بکەمەوە.

بە دەنگێکی لەرزۆک درێژەی بە قسەکانی دا: «هێندێ کەس دەڵێن کە کچە دڵی پێی سووتا و بەستەزمانە چونکە بێ ئەزموون بوو و ئاگای لە حاڵ و باڵی خەڵک نییە، پێی وابوو دەتوانێ ئەوی خۆش بووێ و شووی پێکرد، "ئەلف"ی گەلحۆش خەیاڵی ئەوی بە ڕاست زانی و پێی وابوو عومری لە نوێ نووسراوەتەوە و جوان و جحێڵ بۆتەوە. بەڵام کچە خۆی دیتی کە ئەوی هەڵخەڵەتاندووە و خۆشی فریوی خواردووە...» سێرگی میخائیلیچ کە دیار بوو تاقەتی درێژە پێدانی ئەو باسەی نییە بەو ئاکامە گەیشت کە «لێگەڕێ با ئیتر لەو بارەوە نەدوێین.» پاشان دەستی کرد بە پیاسە کردن.

ئەو گوتی کە ئیتر قسە نەکەین و من دیتم کە خۆی هەڵدەگوشێ و لە قسەیەک دەگەڕێ کە بە منی بڵێ. دەمویست قسە بکەم بەڵام نەمدەتوانی، وەک ئەوە وابوو چزوویەک لە دڵم هەڵچەقیبێ. سەرم بۆ لای ئەو وەرسووڕاند. ڕەنگی بزڕکا بوو و لێوی خوارەوەی دەلەرزی. زۆرم دڵ پێی سووتا. بە هەوڵێکی زۆر ئەو دیواری بێدەنگییەم ڕووخاند و بە دەنگێکی هێواش کە لە دڵمەوە هەڵدەقوڵا و دەترسام هەر ئێستا لە دەریای ئەسریندا نوقم بێ، گوتم: «لایەنێکی تریش هەیە. هێندێ کەسیش دەڵێن "ئەلف" "ب"ی خۆش نەدەویست و زویری کرد، زۆری ڕەنجاند و پێی وابوو ڕێگای ڕاستی گرتۆتە بەر. ڕۆیشت و شانازیی بە کارەکەی خۆیەوە دەکرد کە مەعلووم نەبوو تاجی لە سەری کێ ناوە. ئەوە ئێوەن نەک من کە ئەو کارە بە گاڵتە دەزانێ. من هەر لە ڕۆژی یەکەمەوە دڵم پێدای.» دیسان گوتیشم: «...بەڵێ بە گیان و دڵ عاشقت بووم و دڵم پێدای!» ئەم جارەیان بێ ئیختیار

**دەنگم بەرز کردەوە و دەنگی ئارام و لەسەرە خۆم بوو بە هاوارێکی هۆڤانە کە تەنانەت خۆشم ترسم لێ دەنشیشت.**
**بەرەو ڕووی من ڕاوەستا بوو و ڕەنگی بە ڕووەوە نەما بوو. لێوی سات لە دوای سات زیاتر دەلەرزی و دوو تنۆک فرمێسک لە سووچی چاوی هاتنە دەرێ و بە سەر ڕوومەتیدا خلیسکان.**
**بە دەنگێکی نزیک بە هاوار کردن گوتم: «ئەو کارەی ئێوە زۆر ناحەزە، زۆر کارێکی دزێوە!» هەروەها بە هەستێکی گریاناوی و ڕقێکی لە گەرووردا پەنگ خواردوو گوتم: «ئاخەر بۆ؟» دەمویست هەستم و بڕۆم و لێی دوور کەومەوە.**
**بەڵام نەیهێشت هەستم و سەری کردە سەر چۆکم و لێوی نایە سەر دەستە لەرزۆکەکانم. ماچی کردن و بە فرمێسکی پشتی دەستی خووساندم.**
**گوتی: «خودایە گیان، بۆ نەمدەزانی؟»**
**بەردەوام دووپاتم دەکردەوە: «بۆ؟ ئاخر بۆ؟» دڵیشم بە تیشکی بەختەوەری ڕووناک بوو. بەختەوەرییەک کە هەمیشە پێم وابوو لە دەستم دەرچووە و پێموا بوو تازە دەستم پێی ڕاناگاتەوە.**
**پێنج خولەک دواتر سۆنیا بە هەڵەداوان خۆی گەیاندە لای کاتیا لە قاتی سەرێ و هاواری دەکرد و ماڵەکەی لە خۆشیانا وەلەرزین دەخست و دەیگوت: «ماشا دەیهەوێ شوو بکات بە سێرگی میخائیلیچ.**

## پێنج

**هیچ هۆکارێک نەبوو کە زەماوەندەکەمان وەدوا بخەین. نە من ئەوەم دەویست نە ئەو. هەڵبەت کاتیا دەیویست بچێت بۆ مۆسکۆ و بۆ جیازیی من ئەوەی پێویستە بیکڕێ یان ڕاسپێرێ بۆمان ئامادە بکەن، بەڵام دایکی سێرگی میخائیلیچ لەسەر ئەوە پێداگر بوو کە کوڕەکەی بەر لە زەماوەند فایتوونێکی نوێ بکڕێ و قەنەفە و کاغەز دیواریی ماڵەکەیان بگۆڕێ، بەڵام ئێمە هەردووکمان لەسەر ئەوە سوور بووین کە کاتێک ئەو کارانە ئەنجام دەدەین کە زۆر پێویست بێ و دواتر دەرفەتی ئەو کارانەمان دەبێ و زەماوەند دوو حەوتوو دوای ساڵڕۆژی لە**

دایکبوونم، بە بێدەنگی و بە بێ جیازی و میوانی و برازاو و خواردنەوەی شامپانی و ئەو شتانە، وەلحاسڵ بە بێ ڕێوڕەسمی باو کە بۆ زەماوەند بەڕێوە دەچێ توانیمان ژیانی هاوبەش دەست پێبکەین. ئەو بۆی باس کردم کە دایکی زۆر نارازییە کە زەماوەندەکەمان بەبێ ڕێوڕەسم و ئۆرکێسترا و مۆسیقا بەڕێوە دەچێ و بارخانەیەک سندووق و کەلوپەل بۆ ماڵەکەیان ناچێ و ماڵەکە لە تەرکی بنەکەیەوە هەتا بنمیچ نوێ ناکرێتەوە و وەکوو زەماوەندەکەی خۆی نابێ کە سی هەزار ڕۆبڵی خەرج هەڵگرتبوو و لەگەڵ ماریۆشکای کلیل داری خۆی خەریکی دابین کردنی مافوورە و ڕاخەر و پەردە و دەفر و قاپاخی پێویست بوو کە پێی وابوو بۆ ژیان و بەختەوەریی ئێمە زۆر زەرووریيە. لە ماڵی ئێمەش کاتیا هەر وابوو، لەگەڵ کووزمی نیشنا[١٢]ی دایەنم خەریکی تەگبیر و ڕابوون. ئەو پێی وابوو ئەو کارە زۆر جیددییە و بۆ گاڵتە نابێ. ئەو لێی ڕوون بوو کە قسە و باسی من و دەزگیرانەکەم سەبارەت بە داهاتوومان تەنیا هێندێک ڕاز و نیاز و وڕاوەی ئاشقانەیە و هەڵبەت ئەویندار و دڵدۆڕاویش لەوە زیاتریان لێ چاوەڕوان ناکرێ. بەڵام لە ڕاستیدا بەختەوەریی داهاتووی ئێمە تەنیا پەیوەندیی بە بڕینی جوان و دوورینی شارەزایانەی کراس و پەڕاوێزی ڕوومێزی و گوڵدۆزی و دەسماڵ و سفرە و ئەو جۆرە شتانەوە هەبە. ڕۆژی چەند جار زانیاریی نهێنی لە نێوان پۆکرۆڤسکۆڤیا و نیکولسکۆیا ئاڵوگۆڕ دەکرا و سەبارەت بەوەی کە لەو دوو ماڵەدا چی ڕادەبرێ و کاریان بە کوێ گەیاندووە. ئەگەرچی سێرگی میخائیلیچ پێوەندییەکی زۆر دۆستانەی دامەزراند بوو، خۆمانە بوونەکەی بە سیاسەتێکی زۆر ناسک ڕازاندبۆوە کە لەژێرەوە ژەنگ و غەوری جۆرێک دژایەتیی لەخۆ گرتبوو. من لەگەڵ دایکی ئەو، تاتیانا سمیۆنۆڤنا زۆرتر سەری ئاشنایەتیم داخستبوو و دەمدیت ژنێکی خۆنوێن و لووت بەرزە و زۆر کۆنە پەرستانە هەڵسوکەوت دەکات و لە کاروباری بنەماڵەدا زۆر سەختگیرە. سێرگی میخائیلیچ ئەوی زۆر خۆش دەویست و لە قسەی دەرنەدەچوو، ئەویش نەک بە هۆی خۆشەویستیی دایک و عەولادەوە بەڵکوو لە ناخی دڵەوە خۆشی دەویست و ئەوەی بە باشترین و بە هۆشترین و دڵپاکترین و دلۆڤانترین ژنی دنیا دەزانی.

---

[١٢] KOUZMINICHNA

تاتیانا سمیۆنۆڤنا هەمیشە لەگەڵ ئێمە دڵنەرم و مێهرەبان بوو و بە تایبەت دەرهەق بە من، زۆریش دڵخۆش بوو کە کوڕەکەی ژن دێنێ. بەڵام کاتێک وەک دەسگیرانی کوڕەکەی دەچووم بۆ سەردانی پێم وابوو حەزی لێیە من تێبگەیێنێ کە کوڕەکەی دەیتوانی ژنێکی باشتر بێنێ و من واباشە ئەوەم لە بیر نەچێ. لەو هەستەی ئەو دەگەیشتم و پێم وابوو مافی خۆیەتی وابیر بکاتەوە.

لە ماوەی ئەم دوو حەوتووەدا ئێمە هەموو ڕۆژێ چاومان بە یەکتر دەکەوت. ئەو بۆ نانی نیوەڕۆ دەهاتەوە و هەتا نیوەشەو لەوی دەمایەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە دەیگوت ناتوانی بەبێ من بژی ـ منیش دەمزانی بەڕاستییەتی ـ قەت ڕۆژێک هەتا سەر لەلای من نەدەمایەوە و هەروەها هەوڵی دەدا و وک جاران و بە شێوەی ئاسایی بە کارەکانی خۆی ڕابگا. لە ماوەی ڕۆژانی دەسگیرانەتیماندا پێوەندیی ڕواڵەتیمان گۆڕانێکی بەسەردا نەهات. وەک ڕابردوو بە یەکترمان دەگوت "ئێوە" و ئەو تەنانەت دەستیشی ماچ نەدەکردم و نەک بۆ دەرفەتێک نەدەگەڕا لەگەڵ من بە تەنیا بێ بەڵکوو لە دەست دەرفەتەکانیش هەڵدەهات. دەتگوت دەترسێ خۆی تەسلیمی ئەو خۆشەویستییە گەرموگوڕەی من بکات کە لە دڵیدا بوو و تاڕادەیەکیش لە ئاکامەکەی دڕدۆنگ بوو. نازانم ئەو گۆڕابوو یان من. ئەوەندە بوو من خۆم لەگەڵ ئەو یەکسان دەدی و خۆڕانان بە ساکارییەوە کە لە ڕابردوودا حەزم لێی نەبوو ئیتر لە هەڵسوکەوتی ئەودا نەمدەدی و زۆرجار چێژم وەردەگرت کە ئیتر پیاوێک لەگەڵ خۆمدا نابینم کە ڕێز و ترس لە دەروونمدا هەڵخڕێنێ و بە جێی ئەو منداڵێکم دەدی زۆر مێهرەبان و بەهۆی بەختەوەرییەوە پەرێشان بوو. زۆر جار بە خۆمم دەگوت: «چەندە بە هەڵە چووبووم. ئەو مرۆڤێک بوو کتومت وەک خۆم.» ئێستا دەمزانی کە ئەو بەو شێوەیەی کە هەیە بەرەو ڕووی خۆم دەبینم و بە تەواوی دەیناسم و ئەو دەموچاوەی دەمناسی زۆر سادە بوو لەگەڵمدا. هاودڵ و یەکڕەنگ. تەنانەت ئەو پلان و بەرنامانەی بۆ داهاتوومان دامانده‌ڕشت و دەمانویست ژیانمان بە پێی ئەو درێژە پێبدەین ڕاست وەکوو یەک وابوون. تەنیا کاتێک ئەو باسی دەکرد ڕووناکتر و ئاشکراتر دەبوو.

لەو ڕۆژانەدا هەوا خۆش نەبوو و ئێمە زۆربەی کاتەکانمان لە ماڵەوە ڕادەبوارد و لە ژوورێ دەخزاین و لە نێوان پەنجەرە و پیانۆکەدا دادەنیشتین و قسەمان

دەکرد، قسەی زۆرشیرین و هاودڵانە. شۆقی مۆمەکە لە شووشەی تاریکی پەنجەرەکەی دەدا و دەیکرد بە ئاوێنە و جارجار دڵۆپی باران لە شووشەی بریقەداری پەنجەرەکەی دەدا و وەک فرمێسک بەسەر گۆنای لووسیدا دەخزییە خوارێ. باران لە سەربانی دەدا و ترپەی دەهات و خوڕەخوڕی پلووسک دەهات و تەڕایی لە کەلێنی پەنجەرەکەوە دەزایە ژوورێ و هەستێکی گەرمتر و ڕووناکتر و پڕ شادیتری لە خەڵوەتی ئارام و پڕ ئۆقرەماندا پێک دێنا.

جارێک کە شەو زرنگابۆوە و ئێمە هەروا لە ژوورێ پێکەوە دانیشتبووین گوتی: دەزانی ماوەیەکە دەمهەوێ شتێکت پێ بڵێم. کاتێک پیانۆت دەژەنی هەمیشە لە بیری ئەوەدا بووم.»

گوتم: «پێویست ناکات، دەزانم دەتەوێ بڵێی چی!»

ئەو زەردەیەکی گرت.

-«بە ڕاستیمە. هەر باسیشی مەکە.»

-«باشە، هەر گوێی مەدەیە، لەسەر چووان مەچۆ!»

-«نا، ئێستا پێم بڵێ، دەتویست چیم پێ بڵێی؟»

-«چاکت لە بیرە، کاتێک من ماجەرای ئاغای، "ئەلف و خانمی "ب"م بۆ باس کردی؟»

-«مەگین ئەو چیرۆکە بێ تام و بێ بنەمایەت لە بیر نەچۆتەوە؟ چاک بوو بە خێر گوزەرا و ڕێسەکەی لێ نەکردینەوە بە خوری و کارمان بەم جێیە نەگەیشت!»

-«بەڵێ، زۆری نەما بوو من بە دەستی خۆم ژیانم ڕەش دابگێڕم و لەم بەختەوەرییە خۆم بێ بەش بکەم. ئێوە منتان نەجات دا. بەڵام گرینگ ئەوەیە من درۆم دەکرد و هەر ئەوەش تووشی شەرمەزاریی کردووم، ئێستا دەمهەوێ ئەو بارە لەسەر دڵم لابەم و ددانی پێدا بنێم کە بە دڵ خۆشم دەویستی.»

-«ئەیەڕۆ، جائەوە قسەیە! باسی ئەوە هەر مەکە!»

بە بزەیەکەوە گوتی: «خەمت نەبێ. من تەنیا دەمەوێ پاکانە بۆ ئەو کارەی خۆم بکەم. من کاتێک ئەو قسانەم دەکرد دەمویست بەڵگە بۆخۆم بهێنمەوە.»

-«چ بەڵگە هێنانەوەیەک؟ نابێ بیر لەشتی وا هەر بکەیەوە.»

«بەڵێ، من بەڵگەی خراپم دەهێنایەوە. کاتێک دوای ئەو هەموو هیوابڕاوی و هەڵەکانم و ناکام بوونە لە ژیاندا، هاتمەوە بۆ گوند دڵنیا بووم کە ئەوین و ئەوینداری ئیتر بۆ من کۆتایی هاتووە و جگە لە ئەرکی ڕابواردنی پاشماوەی تەمەن هیچ ئەرکێکی دیکەم نییە و هێندە سەرقاڵی ئەو مەسەلانە بووم و تووشی ئاستەنگیان کردبووم کە بۆ ماوەیەک بە هیچ شێوەیەک بیرم لە چۆنیەتیی هەستم دەرهەق بە ئێوە و ئەوەی کە ئەو هەستە بەرەو کوێم دەکێشێ و بە کوێ دەگا، نەدەکردەوە. هیوادار بووم و بێ هیواش. هێندێ جار پێموا بوو دەتهەوێ دڵم لێ بستێنی و هێندێ جاریش باوەڕم بە سەداقەت و پاکیی ئێوە دەکرد و نەمدەزانی بە ڕاستی چبکەم. بەڵام دوای ئەو شەوە ـ لە بیرتانە، ئەو شەوەی لە باخەکەدا پیاسەمان کرد ـ ترس سەرتاپای داگرتم. بەختەوەریی ئەمڕۆم لە ڕادە بەدەر پێ مەزن بوو و بە کارێکی مەحاڵم دەزانی و قەت بڕوام نەدەکرد بەم ڕۆژە بگەم. ئەگەر هەوساری دڵم ڕەها کردایە و باڵی هیوام پێ ببەخشیبایە و پاشان هیواکەم باڵی بشکایە و بە ناکامی بگەیشتبایە چی ڕووی دەدا؟ بەڵام، با ئەوەش بڵێم من تەنیا بیرم لە خۆم دەکردەوە، چونکە پیاوێکی خۆبین و بەدخووم.»

چاوی لە من بڕی و تۆزێ بێدەنگ بوو.

ـ«بەڵام ئەوەی لە دڵمدا بوو زۆر بێ بنەما بوو. ترسەکەی من بەجێ بوو. من ئێوەم بە گەورەترین خەڵاتی دنیا دەزانی و خۆشم هیچ شتێکم بە جەرگەوە نەبوو و نەمدەزانی لە بەرانبەر ئەو خەڵاتە گەورە و پیرۆزەدا چیتان پێشکەش بکەم. ئێوە نەمامێکی شلک و ناسک بوون، خونچەیەک بوون لەحاڵی پشکووتندا. دڵتان بۆ یەکەم جار بە نووری ئەوین ڕووناک دەبۆوە، کەچی من...»

گوتم: «بەڵێ، ڕاستییەکەیم پێ بڵێن...» بەڵام لەناکاو لە وەڵامێکی ترسناک کە ڕەنگ بوو بیداتەوە دەترسام. گوتیشم: «نا، پێویست ناکا شتێک بڵێن!»

ئەو لە ڕێوە لە مەبەستەکەم تێ گەیشت و گوتی: «دەتەوێ بزانی کە پێش تۆ کەسێکم خۆش ویستووە، وانییە؟ وەڵامەکەی دژوار نییە. نا، هیچ کەسم خۆش نەویستووە. قەت قەت هەستێکی وەک ئێستام...» بەڵام کتوپڕ،وەک ئەوەی بیرەوەرییەکی تاڵ وەک برووسکە بە زەینیدا تێپەڕیبێ، بە حاڵەتێکی خەمناکەوە گوتی: «ئێستاش بە تەواوی وجوودەوە پێویستم بە دڵنەرمی و مێهرەبانیی ئێوە

هەیە بۆ ئەوەی شایانی خۆش ویستنتان بم. یانی نابێ بەر لەوەی بڵێم "خۆشم دەوێن" تۆزێ بیرم لێ کردبایەوە؟ ئاخەر من چیم هەیە فیدای ئێوەی بکەم؟ بەڵێ، هەڵبەت جگە لە دڵ و ئەشقم هیچ شتێکی دیکەم نییە!»

چاوم لە چاوی بڕی و گوتم: «بۆ ئەوە شتێکی کەمە؟»

ئەو درێژەی پێدا: «زۆر کەمە، خۆشەویستەکەم! بۆ ئێوە زۆر کەمە. بۆ جوانی و گەنجیی ئێوە زۆر کەمە. من ئێستا زۆربەی شەوان بەخەبەر دەمێنمەوە و بەخەبەر بوونەکەشم زۆر شیرینە. چونکە بیر لە ژیانی داهاتوومان دەکەمەوە. من زۆرم تەمەنی خۆم بە فیڕۆ داوە و ساردوگەرمیی ڕۆژگارم چێشتووە، بەڵام ئێستا پێم وایە ئەوەی بۆ بەختەوەریی ژیان پێویستە بە دەستم هێناوە. تەنیایی و ئاسوودەیی لە گوندێکی دووردەست و یارمەتی دانی گوندنشینان، کە سەر کەوتن لەو کارەدا ئاسانە، چونکە ئەوان پێی ڕاهاتوون. جگە لەوەش هەوڵ دان، کە ڕەنگە بەکەڵکیش بێ و دوای ئەو پشوودان لە باوەشی سروشتدا و متاڵا و مۆسیقا و خۆشویستنی هاوڕەگەز، ئەمانە هەمووی ئامانجی بەختەوەرین و من قەت خولیایەکی گەورەتر و جوانتر لەوەم نەبووە و ناشمبێ. جگە لەمانەش و لە سەرووی هەموویانەوە هاوڕێیەکی وەک تۆ،هاوژینێکی پاک و دڵسۆز، چێژی بنەماڵە و شیرنایی ژیان و ڕەنگە هەر شتێک کە مرۆڤ لەوانەیە ئاواتی بۆبخوازێ، ئیتر لەوە زیاتر چیم دەوێ؟»

گوتم: «بەڵێ...»

ئەو درێژەی بە قسەکانی دا«...بەڵێ، ئەوانە بۆ من، کە تافی لاویی خۆم بەفیڕۆ داوە، ئەوپەڕی بەختەوەرییە. بەڵێ، بەڵام نەک بۆ ئێوە! ئێوە هەنووکە هیچتان لە ژیان نەدیوە و ڕەنگە بتانەوێ لە جێیەکی تر بە دوای بەختەوەریدا بگەڕێن و لە شتێکی تردا بیدۆزنەوە. ئێوە ئەوە بە بەختەوەری دەزانن چونکە منتان خۆش دەوێ.»

گوتم: «نا، وانییە، من هەمیشە هەر ئەوەم ویستووە. قەت جگە لە ژیانێکی ئارامی بنەماڵە هیچ خولیایەکی دیکەم نەبووە و ئێوە ڕاست باسی شتێک دەکەن کە هەمیشە لە دڵمدا بووە.»

ئەو زەردەیەکی گرت.

«نا ئەوانە خەیاڵن خۆشەویستەکەم! قەت ئەوە بۆ ئێوە بەسندە ناکات.»

دیسان گوتی: «ئێوە گەنج و شۆخوشەنگن!»

لەوەی کە بڕوای بە قسەکانم نەدەکرد ڕقم هەستا. دەتگوت بە هۆی جوانی و شۆخوشەنگییەکەمەوە لۆمەم دەکات.

بە دڵمەندییەوە گوتم: «پێم بڵێ بزانم، ئێوە بۆچی منتان خۆش دەوێ؟ لەبەر گەنجییەکەم یان لەبەر خۆم؟»

وەڵامی دایەوە: «نازانم، بەڵام خۆشم دەوێن.» پاشان بەوردی و نیگای گەرمی چاوی لە چاوم بڕی.

ئیتر قسەم نەکرد و نەخوازراوانە تێی ڕامام. لەناکاو هەستێکی سەیر لە ناخمدا سەری هەڵدا. سەرەتا ئەوەی لە دەوروبەرم بوو هیچیم نەدەدی. پاشان ڕوخساری لەبەر چاوم بزر بوو و تەنیا چاوانی مانەوە کە دەتگوت ڕاست لەبەر چاومدا دەدرەوشێنەوە. دوای ئەوە هەستم کرد کە ئەم چاوانە لە نێو هێلوونی چاوانی مندان و پێشیان تاریک داگەڕاوە و من لە نێو ئەواندا هیچ نابینم و ناچار بووم پێلووی چاوم داخەم تاکوو خۆم لەو هەستی چێژ و ترسە دەرباز کەم کە ئەو نیگایە لە ناخمدا هەڵیخڕاند بوو.

ڕۆژێ بەر لە زەماوەندەکەمان هەواکەی زۆر خۆش بوو و دوای ڕێژنە بارانی کۆتایی هاوین یەکەم ئێوارەی سارد و زێڕینی پاییز دڵی خەڵکی ڕووناک دەکردەوە. وڵات تەڕ و بڕ و پڕ لە گۆلکاو بوو، هەواکەی سارد و گەڵای ئەرخەوانیی داران دەدرەوشانەوە و باخ و دارستان بەرین و بەربڵاوتر دەهاتە بەر چاو و ڕەنگی خەزانیان لێ نیشتبوو: خەزەڵوەری ڕەنگین و داری ڕووتەڵ و بێ گەڵا بەرگێکی ئاڵتوونی بوون کە سروشت لەبەر ی خۆی کردبوو. ئاسمان ڕووناک بوو و ڕەنگە پەڕیوەکەی سەرمای لێ دادەڕژا. من چوومە نێو پێخەفەکەمەوە، شاد و دڵخۆش لەوەی کە بەیانی، ڕۆژی زەماوەندەکەمانە، ڕۆژێکی خۆش و پڕ لە شادی و پێکەنین دەبوو.

ڕۆژی دوایی لەگەڵ هەڵاتنی خۆر لە خەو هەستام و بیری ئەوەی کە «ئەمڕۆ...» ترسی خستە دڵمەوە. ئەو خەیاڵە زۆر بەلامەوە سەیر بوو. چووم بۆ نێو باخەکە. خۆر تازە هەڵاتبوو و تاووبان گەرم داهاتبوو، تیشکی زێڕینی خۆر لە

نێوان لکی ڕووتەڵی دارانەوە دادەڕژا و بەسەر چیمەنی زەرد و توولەڕێی خیزڕێژکراوی پڕ لە خەزەڵی باخەکەدا دابەش دەبوو. فەڕشی گەڵای وەریو لەژێر دارەکاندا خشپەی دەهات. وردە پەرەنگی تۆوی وشک و سوورهەڵگەڕاوی درەختی بناو وەک هێشوو بە لک و پەلکەکانییەوە دەدرەوشایەوە و گەڵای سیس و هێشتا دەست لە لق بەرنەبوو، سڕ و تۆز لێ نیشتوو سپی دەچوونەوە. تۆپی پڕ پەلکی گوڵە بژۆێن لوول و چرچ بووبوون و ڕەش هەڵگەڕا بوون. یەکەم جار بوو کە زوقم و خووسار لەسەر چیمەن و گیا و گژی نێو باخەکە و بنجی شکاو و بە لادا کەوتووی گیاهەوێداری پەنا دیوارەکە کەوتبوو و تارای زێوینی بەسەردا کێشا بوون. ئاسمان ساو و بێ هەور بوو، تا چاو هەتەری دەکرد شینایی بوو!

بڕوام بەو بەختەوەرییەی خۆم نەبوو و لە دڵی خۆمدا دەمگوت: «یانی بە ڕاستی ئەمڕۆیە؟ یانی بەڕاستی سبەینێ بەیانی ئیتر من لێرە لە خەو هەڵناستم؟ یانی هەر بە ڕاستی لەمە بەدواوە لێرە چاوەڕوانی نابم و بۆ بینینی ساتەکان نابژێرم، تاکوو بگاتە ئێرە و بچم بەرەو پیری؟ ئیتر شەوانە لەگەڵ کاتیا باسی ئەو ناکەم؟ ئیتر لەگەڵ ئەو لە هۆڵی پۆکرۆڤسکۆڤیا لە پشت پیانۆ دانانیشم؟ ئیتر بە شەوی تاریک تا دەرەوەی ماڵ بەڕێی ناکەم؟ ئیتر بۆی بێ تاقەت نابم؟» بەڵام وەبیرم هاتەوە کە شەوی ڕابردوو گوتبووی جارێکی تر بۆ دوایین جار دێمەوە و کاتیا لەسەر ئەوە پێداگریی دەکرد کە من کراسی بووکێنی لەبەر بکەم و خۆم بڕازێنمەوە و گوتبووی: «دەبێ بۆ سبەینێ تەمرین بکەی!» منیش بۆ ساتێک هاتمە سەر قسەکەی بەڵام دواتر دیسان دوودڵ بووم کە لەبەری بکەم یان نا. «یانی لەمە بەولاوە لەگەڵ خەسووم دەژیم و ئیتر چاوم بە نادیژا[13] و گریگۆریی پیر ناکەوێ و لە کاتیا دوور دەکەومەوە؟ ئیتر بەر لەخەوتن دایەنم ماچ ناکەم و ئیتر گوێم لە «شەو خۆش خاتوو گیان»ی نابێ و بە شێوەی قەدیمی خاچم بکێشێ و دامپۆشێ؟ ئیتر دەرس بە سۆنیا ناڵێم و یاریی لەگەڵ ناکەم و بەیانی ڕای ناتڵەکێنم تاکوو لە خەو هەستێ و ئیتر گوێم لە قرشکەی پێکەنینەکانی نابێ؟ یانی من بە ڕاستی ئەمڕۆ دەبمە مرۆڤێکی دیکە و لەگەڵ ژیانی ئێستام بێگانە دەبم؟ یانی بە ڕاستی ئەم ژیانە نوێیە بۆ هەمیشە دەمگرێتە خۆی و لە

[13] Nadyeja

ڕایردووم دادەبڕێ؟» زۆر بێ سەبرانە چاوەڕێ بووم. تێکەوتن لەگەڵ ئەو بیر و خەیاڵانە و ململانێ کردن لەگەڵیان زۆر بەلامەوە دژوار بوو. ئەو زوو هات. تەنیا کاتێک کە لەگەڵیدا بووم بڕوام کرد کە ئەمڕۆ دەبمە هاوسەری و ئەو خەیاڵە ئیتر ترسێنەر نەبوو بەلامەوە.

بەر لە نیوەڕۆ چووین بۆ کلێسە تاکوو لە ڕێوڕەسمی عیشای ڕەببانیدا بەشداری بکەین کە بۆ شادیی ڕۆحی باوکم بەڕێوە دەچوو.

کاتێک گەڕاینەوە بۆ ماڵێ لە دڵی خۆمدا گوتم: «ئەگەر ئێستا زیندوو بووایە!...» بەبێ ئەوەی زمانم بگەڕێ خۆم بە قۆڵییەوە نووساند، کە نزیکترین هاوڕێی کەسێک بووە کە ئەمڕۆ بیر و خەیاڵی منی بە خۆیەوە خەریک کردووە. کاتی دۆعا، نێوچاونم خستە سەر بەردی ساردی تەرکی توێژگەکە و باوکمم وەک کاتی زیندوو بوونی هاتە بەرچاو و دڵنیا بووم کە ئەو لە حاڵی ڕۆحیی من تێدەگا و ئەو شوکر کردنەمی بە دڵ دەبێ و تەبەڕووکم پێدەدا و تەنانەت ئەمڕۆ پێموایە ڕۆحی ئەو لەو کاتەدا لەوێ بوو و بە سەرسەری ئێمەوە دەفڕی و تەبەڕوکی ئەوم لە خۆمدا هەست پێدەکرد و بیرەوەریی و هیوا و بە کاوی دڵ گەیشتن و خەفەت، هەموو پێکەوە تێکەڵ دەبوون و هەستێکی خۆش و پڕ شکۆ بوو کە زۆر لەگەڵ هەوای خۆش و ئارام و بێدەنگیی دەشتی ڕووتەن و ئاسمانی کەمڕەنگ دەهاتەوە کە پڕشنگی ڕوون و کەم تینی خۆر هەوڵی دەدا کوڵمەکانی من بسووتێنێ و بەسەر هەموو شتێکدا دادەڕژا. بە دڵ هەستم کرد کە هاوڕێکەم لەو هەستەی من تێدەگات و هاوبەشی ژیان و خەیاڵ و ئاواتەکانمە. بە ئارامی شان بە شانی من هەنگاوی دەنا و بێدەنگ بوو، ڕوخساری کە من جارجار چاوم لێدەکرد حاڵەتێکی جیددی لە خۆ گرتبوو، ئاوێتەیەک لە خەم و شادی، هەر ئەوەی لە سروشتیدا هەبوو و لە دڵی منیشدا.

لەناکاو ڕووی بۆ لای من وەرگێڕا و من بۆم دەرکەوت دەیهەوێ شتێک بڵێ. لە دڵی خۆمدا گوتم: «ئەگەر باسی هەر ئەو شتە نەکات کە لە دڵمدایە چبکەم؟» کە قسەکەی کرد باسی باوکم بوو، ئەگەرچی ناوی نەهێنا.

گوتی: «ڕۆژێک بە گاڵتە پێی گوتم "ماشا بخوازە"!»

من قۆڵیم بە قۆڵی خۆمەوە گوشی و گوتم: «ئەگەر بمایە چەندە خۆشحاڵ دەبووا!»

ئەو چاوی لە چاوم بڕی و وتەکەی خۆی درێژە پێدا: «بەڵام ئێوە ئەو کاتە منداڵ بوون. من ئەو کاتە ئەم چاوانەتم ماچ دەکرد و خۆشم دەویستن، بەڵام تەنیا بەو هۆیەی شێوەی چاوی ئەوی دەدا و قەت پێم وانەبوو ڕۆژێک ئەوانم لەبەر خاتری خۆی خۆش دەوێ. من ئەو کاتە ئێوەم بە ناوی "ماشا" بانگ دەکرد.»

گوتم: «ئەی بۆ ئێستا وا بانگم ناکەی؟»

گوتی: «ڕاستت دەوێ دەمویست هەر ئەو کارە بکەم. ئێستا ئیتر هەست دەکەم هی خۆمی و لەگەڵ ڕۆح و گیانم تێکەڵ بووی!» بە چاوێکی مێهرەبان و ئارام و شیرین کامەوە تێی ڕوانیم.

بەڵام هەروا لە نێو گەنمجاڕی درێنە کراو و پێشێل کراودا بە دوای جێگاپێیەک دا دەگەڕاین کە بەحاڵ دیار بوو و جگە لە خشپەی پێی خۆمان و قسەکردنمان هیچ شتێکی دیکەمان نەدەبیست. لە لایەکەوە، لەو بەری شیوەکەوە هەتا دارستانە پایزە لێدراوە دوورەکە، جاڕەگەنمەکەمان دەدی کە بە سرووت و وردە کلۆشی مەیلەو قاوەیی داپۆشرا بوو، لە دوورەوە چاومان بە جوتیارێک کەوت بە نیروئاموور خەتێکی ڕەشی بە زەوییەکەدا کێشا بوو و خەتی جووتەکەی جار لەگەڵ جار پانتر دەبۆوە. ڕەوە ئەسپی داوێنی گردەکە بەو جاڕە دێمەدا بڵاو بووبوونەوە و دەتگوت زۆرمان لێ نزیکن. لە لایەکی دیکەوە، لە پێشمانەوە، هەتا دەگەیشتە باخ و دیوەخانەکە، کە لەو بەری دارستانەکەوە دیار بووشێوەردەکان ڕەش دەچوونەوە. جێگاجێگاش ڕەپستەی پاییزی شین بووبوو. هەتاو ڕووناک و کەم تین پڕشنگی نەرمی خۆی بەسەر هەموو جێگایەکدا دەباراند و سەرما وەک داوە جاڵجاڵووکە زوقمێکی تەنکی بەسەر هەموو شوێنێکدا کێشا بوو. تاڵی باریکی کەڕەسیسە بە دەم نەرمە باوە لە ئاسمان دادەبارین و دەنیشتە سەر وشکە گیا و سرووتی سەرما بردووی جاڕەگەنم و جۆی دروێنەکراو و جاری وابوو دەچوونە چاومانەوە و دەنیشتنە سەر قژ و شان و پیلمان، کاتێک قسەمان دەکرد دەنگمان بە حەواوە لە ژوور سەرمان لە هەوای ساکندا دەمایەوە و دەتگوت تەنیا ئەو دوو کەسەین لەسەر زەوی و لە ناوەندی دنیادا پێکەوە دەگەڕێین،

**چونکە ئەو گومبەزە کەهووە، کە خۆری کەسیرە بووی پایز لەسەر سینگی دەدرەوشایەوە و دەلەرزی، ئێمەی دەلاواندەوە.**
**منیش دەمویست بە ئەو بڵێم "تۆ" بەڵام لە ڕووم هەڵنەدەهات.**
**بە دەنگێکی خێرا و وەک ئەوەی سرتە بکەم بە گوێیدا، گوتم: «بۆ ئەوەندە بە توندی دەڕۆی؟» هەر خێراش سوور هەڵگەڕام.**
**ئەو هەنگاوی شل کردەوە و بە نیگایەکی نەرمتر و شادتر کە بەختەوەری تێدا ڕەنگی دابۆوە، پەپوولەی چاوی بەرەو ڕوخسارم هەڵفڕاند و بە شنەی پڕ خۆشەویستیی نیگای لاواندمیەوە.**
**کاتێک گەڕاینەوە بۆ ماڵێ دایکی لەوێ بوو و ماڵەکەمان پڕ بوو لە میوان و هەتا ئەو کاتەی لە کلێسە گەڕاینەوە و سواری فایتوون بووین و بەرەو نیکولسکایا وەڕێ کەوتین، ئیتر لەگەڵیدا بە تەنیا نەکەوتم.**
**کلیسا دەکرێ بڵێین چۆڵ بوو. بە لاچاوێک دایکیم دەدی، کە ڕاست لەسەر مافوورەیەکی پاڵ شوێنی کۆمبێژان ڕاوەستا بوو و چاوم بە کاتیاش کەوت کە کڵاوێکی بە قردیلەی بنەوشەوە لەسەر نابوو و فرمێسک بە ڕوومەتیدا دەهاتە خوارێ و دووسێ کەس لە خزمەتکارەکانیشمان کە لەوێ ئامادە بوون، بە وردی چاویان لێدەکردم. چاوم لە ئەو نەبوو بەڵام هەنتەشی ئەوم لە تەنیشت خۆم هەست پێدەکرد. بە وردی گوێم بۆ دۆعاکان ڕاداشتبوو و لە دڵی خۆمدا دووپاتم دەکردنەوە، بەڵام ئەو وشانە لە گیانمدا دەنگی نەدەدایەوە. نەمدەتوانی بە بێ ئامادە بوونی دڵم دۆعا بکەم و بە نیگایەکی خاڵی لە وێنەی پیرۆز و مۆمەکان و نیشانەی خاچ کە بە نێو پشتی قەشەوە گوڵدۆزی کرابوو و هەروەها پشتی ئەو کاتێک ڕووی لەوێنەی پیرۆز دەکرد و لە پەنجەرەی کلیساکەم دەڕوانی و هیچ تێنەدەگەیشتم. تەنیا هەستم دەکرد شتێکی نائاسایی خەریکە لە ناخمدا ڕوودەدا و گۆڕانێکم بەسەردا دێ. کاتێک قەشە خاچ بە دەستەوە ڕووی لە ئێمە کرد و لەگەڵ پیرۆزبایی بە منی گوت کە هەرخۆی سەرانشۆی داوم و خودا ویستوویەتی کە هەرخۆشی مارەم بکات، پاشان کاتیا و دایکی ئەو هەردووکمانیان ماچ کرد و دەنگی گریگۆریم بیست کە بانگی فەیتوونەوانەکەی کرد، سەرم سووڕ نەما و نەترسام،چونکە کارەکە کۆتایی پێ هاتبوو و هیچ شتێکی نائاسایی و نەگونجاو**

لەگەڵ ئەو ڕازە پیرۆزەی لە دڵی مندا ڕووی دابوو نەهاتبووە پێشێ. ئێمە یەکترمان ماچ کرد و ئەم ماچە زۆر سەیر و لەگەڵ هەستی ئێمە نامۆ بوو. من لە دڵی خۆمدا گوتم: «کەوایە هەر ئەوە بوو؟» لەبەر سەکۆی کلیساکە بووین و دەمانویست پێ بنێینە حەوشە کە دەنگی تایەێ فایتوونێک بەژێر گومبەزی کلێسەدا بای دایەوە و هەوایەکی تازە لە ڕوخساری دام. ئەو کڵاوەکەی لەسەر ناو و قۆڵی گرتم و سواری فایتوونەکەی کردم. لە پەنجەرەی فایتوونەکەوە مانگم دی بە ئاسمانی ساردەوە خەرمانەی دابوو. ئەو خۆشی سوار بوو و دەرگای فایتوونەکەی بە توندی پێوەدا. بەو زرمەیە دڵم ڕێک گوشرا. ئەو کارەی هێندە لێبڕاوانە بوو کە تا ڕادەیەک زیزی کردم. گوێم لە کاتیا بوو هەرای دەکرد: «لەچکەکەت بدە بەسەرتا، سەرمات دەبێ!» فایتوون سەرەتا بە تەقوکت بەسەر ڕێگای سەنگفەڕش کراودا ڕۆیشت و پاشان بە جادەی نەرم و خاکیدا بای دایەوە و ئێمەی لەگەڵ خۆی برد. من لە سووچێکی کەژاوەی فایتوونەکەدا خۆم کوشمەڵە کردبوو و لە پەنجەرەکەوە دەشتی پان و بەرین و ڕووناکم دەدی و جادەکە کە لەژێر تریفەی ساردی مانگە شەودا دوور دەکەوتەوە. چاوم لە ئەو نەدەکرد بەڵام لە خەیاڵی خۆمدا هەستم بە بوونی دەکرد. لە دڵی خۆمدا گوتم: «یانی چی؟ ئاکامی ئەو کاتە گرینگەی کە ئەو هەمووە چاوەڕوانی بووم هەر ئەوە بوو؟» دەتگوت هەر خێرا و ئاوا بە زوویی، بە تەنیا مانەوە لە پاڵ ئەودا ئازاردەر و پڕ سووکایەتییە بۆم. سەرم بۆ لای ئەو وەرسووڕاند و ویستم شتێک بڵێم، بەڵام وشەیەک لە زارم نەهاتە دەرێ. دەتگوت ئەو هەست و خۆشەویستییەی پێشوو لە دڵمدا نەماوە و جێی خۆی داوە بە ترس و دڵەخورپە و وەڕەزی.

ئەو لە وەڵامی ئەو ڕوانینەی مندا بە نەرمی گوتی: «من تا ئێستا بڕوام نەدەکرد ئەو کارەمان ئاوابە خێرایی سەر بگرێ.»

گوتم: «بەڵێ، بەڵام نازانم بۆ دەترسم!»

-«لە من دەترسی، خۆشەویستەکەم؟» دەستی گرتم و سەری کردە سەری و ماچی کرد.

دەستم وەک شتێکی وشک و بێ گیان لە دەستیدا مایەوە و شتێکی سارد لە ناخەوە دڵی ڕێک دەگوشیم.

به هێواشی گوتم: «بەڵێ!»
بەڵام هەر لەو کاتەدا دڵم بە توندی کەوتە کوتەکوت. دەستم لەرزی و دەستی ئەوم گوشی. گەرمم بۆوە و دوای تەزوویەکی سارد، تینێکی گەرم بە سەرتاپای لەشمدا مێروولەی کرد و گەرمی داهێنام. چاوانم لە تاریکیدا لە چاوانی ئەو دەگەڕان و لەناکاو هەستم کرد کە لێی ناترسم و ترسەکەی ساتێک لەمەو بەرم ئەشق و خۆشەویستی بوو. ئەشقێکی تازە و نەرمتر و بەهێزتر لە پێشوو. هەستم کرد کە تەواوی بوون و مانم بە هۆی ئەوەوەیە و لە سایەی وزە و ئەشقی ئەودا هەستم بە شیرین کامی دەکرد.

## شەش

ڕۆژانێکی زۆر و چەند حەوتوو، هەتا دوو مانگی ڕەبەق ژیان لە خەڵوەتی گوند، بەو جۆرەی کە ئەو کاتە بیرمان لێدەکردەوە، بێ ئەوەی پێ بزانین تێپەڕی، بەڵام لە ڕاستیدا ئەو دوو مانگە پڕ لە هەست و خۆشی و هەیەجانە بۆ شیرین کردنی تەمەنمان بناغەیەکی پتەو بوو. ئەو خەون و خەیاڵانەی بۆ ژیانی لادێیمان لەبەر چاومان گرتبوو و پلانمان بۆ دارشتبوو بەو جۆرەی کە پێشبینیمان کردبوو لە ئاو دەرنەهات. ئەگەرچی ژیانمان کەمتر لە خەون و خولیاکانمان شیرین و دڵگر نەبوو، بەڵام لە ژیانی هاوڕێ لەگەڵ سەختگیری و بەجێهێنانی ئەرک و لەخۆ بردوویی، دەرهەق بە هاوڕەگەز کە من بەر لە پێک هێنانی ژیانی هاوبەش بیرم لێ دەکردەوە، لەودا هیچ ئاسەوارێک وەبەرچاو نەدەکەوت. بە پێچەوانە تەنیا هەستی خۆپەرستانە و دڵداری لە نێوانماندا بوو و ئاواتی بە شەرم و حەیا بوون و شادیی بەردەوام و بێهۆ و لەبیربردنەوەی شتەکانی دیکە لە گۆڕێدا بوو. ڕاستە ئەو جاروبار دەچووە ژووری کارەکەی و خۆی خەریک دەکرد، یان هێندێ جار بۆ کارێک دەچوو بۆ شار، یان بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری ملکی گوندەکە، بەم لاو بەو لادا دەڕۆیشت، بەڵام من دەمدی کە دووری و بەجێ هێشتنی من زۆر بە لایەوە دژوارە و ئەو خۆی هەموو

جارێک دانی پێدادەنا کە دوور لە من ناتوانێ هەڵبکات و هەرکارێکی دەیکات بە لایەوە بێ مانایە و نازانێ چۆن دەکرێ پێی ڕابێ و دڵی پێ بدا. بۆ منیش بارودۆخەکە لەوە باشتر نەبوو. کتێبم دەخوێندەوە، پیانۆم دەژەنی یان لەلای دایکی دەمامەوە یان خەریکی کاروباری قوتابخانە دەبووم،بەڵام ئەو کارانەم بۆیە دەکرد چونکە پێوەندیی بە ئەوە بوو و دەبووە هۆی ڕەزایەتی ئەو،هەر مەسەلەیەکیش دەهاتە گۆڕێ کە پێوەندیی بە ئەوە نەبووایە دەستم بۆێ نەدەچوو و تاقەتی ئەنجام دانی ئەو کارەم نەبوو و بە شتێکی قوڕ و بێ مانام دەزانی کە بیر بکەمەوە لە دنیادا کارێک هەیە جگە لەوەی کە پێوەندیی بە ئەوە هەبێ. ڕەنگە ئەوە هەستێکی خۆپەسندانە و ناحەز بێ، بەڵام هەستێک بوو کە دەبووە هۆی دڵخۆشی و شیرین کامیی من و بەرزی دەکردمەوە، بەرزتر لە هەموو شتێک. بۆ من جگە لە ئەو لە دنیادا هیچ شتێک نەبوو و من ئەوم بە باشترین مرۆڤی دنیا و بەری لە هەموو تاوان و هەڵەیەک دەزانی و هەر بەم هۆیە نەمدەتوانی جگە لە ئەو بۆ شتێکی تر زیندووبم. لە ژیاندا هیچ ئامانجێکم نەبوو جگە لەوەی کە لەبەر چاوی ئەو هەر ئەو کەسە بم کە بیری لێدەکاتەوە و گرینگیی پێدەدات و پێی وایە هەم، ئەو منی بە یەکەمین و باشترین ژنی دنیا دەزانی و پێی وابوو خاوەنی هەموو گەورەیی و جوانییەکانی دنیام و منیش هەوڵم دەدا لەبەر چاوی یەکەمین و باشترین پیاوی دنیا هەر ئەوە بم.

ڕۆژێک کاتێک هات بۆ ژوورەکەم خەریکی دۆعاکردن بووم. من چاوێکم لێکرد و درێژەم بە دۆعا و پاڕانەوەکەم دا. ئەو لە پشت مێزەکە دانیشت و کتێبێکی لێک کردەوە تاکوو خەڵوەتەکە لە من تێک نەدات. بەڵام من هەستم دەکرد کە چاوم لێدەکات بۆیە سەرم بۆ لای وەرسووڕاند. ئەو زەردەیەکی گرت و من دەستم کرد بە پێکەنین و ئیتر نەمتوانی درێژە بە دۆعا کردن بدەم.

پرسیم: «تۆ دۆعای خۆت خوێندووە؟»

ــ «بەڵێ، بەڵام تۆ درێژەی پێ بدە. من دەڕۆم!»

ــ «هیوادارم دۆعا بخوێنی!»

ئەو وەڵامی نەدایەوە و ویستی بڕوات بەڵام من نەمهێشت بڕوات.

ــ «خۆشەویستەکەم، وەرە لەبەر دڵی من با پێکەوە دۆعا بخوێنین!»

له تەنیشتم ڕاوەستا و هەر دوو دەستی ناشارەزایانە بەردایەوە و بە ڕوخسارێکی جیددی و لەبزێکی نارەوان دەستی کرد بە دۆعا کردن. هێندێ جار ڕووی بۆ لای من وەردەسووڕاند و لە چاوانیدا خوێندمەوە کە لە ڕوخساری مندا بە دوای یارمەتی و هانداندا دەگەڕێ.
کاتێک دۆعاکەی تەواو بوو پێکەنیم و باوەشم پێداکرد و توند بە خۆمەوە گوشی. سوورهەڵگەڕا و دەستەکانمی ماچ کرد و گوتی: «هەموو شتێکی من تۆی، ژیانی منی! هەر دەڵێی دیسان بوومەتەوە منداڵێکی دە ساڵان و تۆ لە باوەشی بەسۆزتدا دەملاوێنیتەوە!»
ماڵەکەی ئێمە یەکێک لەو خانووبەرە قەدیمییانە بوو کە چەند بەرە پشت بە پشت لەوێدا ڕایانبواردبوو و لەوێدا یەکتریان خۆش ویستبوو و ڕێزیات بۆ یەکتر دانابوو. هەموو شتێک بۆنی خۆشی یادەوەریی شیرینی بنەماڵەی لێدەهات، یادەوەرییەک کە لەگەڵ ئەوەی پێم نایە ئەو ماڵەوە دەتگوت لە ناکاو هەموویان بوونەتە یادەوەریی منیش. هەموو بەرنامە و ڕێک و پێکییەکی بنەماڵە لەژێر چاوەدێریی تاتیانا سمیۆنۆڤنا دابوو کە بە شێوەیەکی سوننەتی بەڕێوە دەچوو. هەڵبەت نەدەکرا بڵێی هەموو شتێک جوان و ناسک و بێ عەیب بوو بەڵام لە خزمەتکارەکانەوە بگرە هەتا دەگاتە کەلوپەل و خۆراک، هەموو شتێک بە خاوێنی و ڕێکوپێکی و بە ڕادەی پێویست ئامادە بوو و وردبینی و سەرنج بەسەر هەموو شتێکدا حاکم بوو، بۆیە ئەو نەزم و تەکووزییە وای لێدەکردی بە چاوی ڕێزەوە لەو ماڵ و حاڵە بڕوانی. لە ژووری میوانداریدا قەنەفەکان جووت جووت بەرەو ڕووی یەک داندرابوون و وێنەی باب و باپیران بە دیوارەکانەوە هەڵواسرابوون و مافوورە و فەڕش و کەنارەی دەستکردی ماڵێ لە ژوورەکاندا ڕاخرا بوون. هۆڵەکە دوو دۆڵاب و پیانۆیەکی گەورە و قەدیمیی لێبوو، هەرکام بە شێوازێک و قەنەفە و کورسیلەی چکۆلەی ڕازاوە بە پەراوێزی زێوین و نەخشونگاری سەرنجڕاکێشەوە. لە ژوورەکەی من، کە بە سەلیقەی تاتیانا سمیۆنۆڤنا ڕازابۆوە، باشترین قەنەفەکانی ماڵێ کە هی سەدەکانی ڕابردوو بوون و بە شێوازی جۆراوجۆر دروست کرابوون و هەروەها ئاوێنەیەکی باڵا نوێنی کۆن کە من سەرەتا نەمدەتوانی بە ئاسوودەیی و بەبێ دڵەخورپە لەبەریدا ڕەوەستم و

تێیدا لە خۆم بڕوانم، بەڵام دواتر بۆ من وەک هاوڕێیەکی لە مێژینە و خۆشەویستی لێ هات. دەنگی تاتیانا سمیۆنۆڤنا قەت لە نێو ماڵەکەدا وەبەر گوێ نەدەکەوت، بەڵام هەموو شتێک وەک کاتژمێرێکی کۆککراو بە ڕێکوپێکی بەڕێوە دەچوو. هەڵبەت ژمارەی خزمەتکارەکان زیاتر لە ڕادەی پێویست بوون و هەموویان پێڵاوی بێ پاژنە و لمەدییان لەپێ دەکرد چونکە تاتیانا سمیۆنۆڤنا زۆری ڕق لە سیرە و تەقەی پاژنەی کەوش بوو و بە ناخۆشترین دەنگی دەزانی و لەڕێوە پێی دەرهەڵدەبوو. خزمەتکارەکان هەموویان بە کاری خۆیان دەنازین و لەترسی لۆمە و سەرکۆنەی خاتوونی گەورەی ماڵێ دەلەرزین و لە دڵەوە من و مێردەکەمیان خۆش دەویست و ڕێزیان بۆ دادەنان و دیار بوو ئەرکی خۆیان بەو پەڕی تامەزرۆییەوە بەڕێوە دەبەن. هەموو ڕۆژانی شەممە تەرکی ژوورەکانیان دەشتەوە و فەڕشەکانیان دەتەکاند. ڕۆژانی یەکەمی مانگ ڕێوڕەسمی عیشای ڕەببانی لە ماڵەوە بەڕێوە دەچوو و ئاوی متفەڕکیان لە هەموو شتێک دەپڕژاند و لە ڕۆژناوەکانی تاتیانا سمیۆنۆڤنا و کوڕەکەیدا میوانداریيان ڕێک دەخست و (لە ڕۆژناوی منیشدا بۆ یەکەم جار لەم پاییزەدا) هەموو خزم و جیرانەکان بانگهێشتن کرابوون و لەو کاتەوە تاتیانا سمیۆنۆڤنا لە بیری بوو قەت ئەو بەرنامەیە چەتی تێنەکەوتبوو و بە ڕێکوپێکی بەڕێوەیان بردبوو. مێردەکەم قەت خۆی لە بەڕێوەبردنی کاروباری ماڵێ وەرنەدەدا و جگە لە کاری کشت و کاڵ خۆی لە هیچ کارێکی تر نەدەدا کە ئەوەش خۆی لە خۆیا کارێکی قورس و دژوار بوو. تەنانەت زستانانیش زۆر زوو لە خەو هەڵدەستا، بە جۆرێک کە کاتێک لە خەو هەڵدەستام ئەوم لە پاڵ خۆمدا نەدەدی. کاتی خواردنەوەی چایی دەهاتەوە، کە هەمیشە دووبەدوو دەمان خواردەوە و دەکرێ بڵێین لەو جەنگەیەدا کە هەوڵ دان و دەردەسەرییەکانی ملکداری کۆتایی پێ هاتبوو، زۆر بە نەشە و کەیف خۆش بوو، حاڵێک کە ئێمە پێمان دەگوت«ئەشقی سروشتی». من زۆر جار داوام لێدەکرد پێم بڵێ بەیانی چیی کردووە و گوزارشتی هێندە بێ سەرەوبەرەی پێدەدام و قسەی تێکەولێکەی بۆ هەڵدەڕشتم کە هەردووکمان لەبەر پێکەنین لەوانە بوو لەخۆ ببینەوە. برێ جار چاوم لە چاوانی و دەمولێوی دەکرد کە دەجووڵانەوە و سەرم لە قسەکانی دەرنەدەچوو و تەنیا چێژم لە دیتنی و بیستنی دەنگی وەردەگرت.

دەیپرسی: «دەی، ئێستا چیم دەگوت؟ پێم بڵێ!» بەڵام من نەمدەتوانی وتەکانی دووپات بکەمەوە. زۆر قۆڕم دەهاتە بەرچاو کاتێک دەمدی باسی شتێکی تر جگە لە خۆمان دەکات. ئاخەر ئەو کارانەی لە گوند ڕووی دەدا لە چاو بەختەوەریی ئێمە کوا بۆ ئەوە دەبوو باسی بکەی! ماوەیەک دواتر بوو من وردەوردە سەرم لەو کارانە دەردەچوو کە دەیکرد و هۆگریم پێ پەیدا کردن. تاتیانا سمیۆنۆڤنا هەتا کاتی خواردنی نانی نیوەڕۆ لە ژوورەکەی نەدەهاتە دەرێ. بە تەنیا چایی دەخواردەوە و لە ڕێگای خزمەتکارانەوە سڵاو و داخوازییەکانی بۆ دەناردین و لە حاڵ و باڵمان ئاگادار دەبوو. لەو خەڵوەتە چکۆڵەی ئێمەدا کە لەوێدا هەموو دنیامان لە بیر دەچۆوە و بە هۆی مەستی و حەز و خۆشەویستییەوە زیاتر لە دنیای شێت و ماخولیاکان دەچوو، کاتێک پەیامێک لە سووچی پڕ لە تەزم و ئەزموونی ئەوەوە بۆ لامان دەهات دەنگدانەوە و زایەڵەیەکی هێندە سەیری هەبوو کە من کاتێک خزمەتکاری تایبەتی دەهات و لە ڕووی ئەدەبەوە دەستی لەسەر یەک دادەنا و بە لەبزێکی ئارام و وشەی داناردانار دەیگوت تاتیانا سمیۆنۆڤنا فەرموویان لێتان بپرسم دوای پیاسە و سەیرانی دوێشەو چۆن خەوتوون و ئەگەر دەتانهەوێ لە حاڵی ئەویش ئاگادار بن دەبێ عەرزتان بکەم کە شەوی ڕابردوو لەبەر ژانی لاکەلەکە و وەڕینی ئەو سەگە نەگبەتییە خەوی لێ نەکەوت، زۆر جار خۆم پێ ڕانەدەگیرا و لە قاقای پێکەنینم دەدا. خزمەتکار درێژەی بە قسەکانی دەدا: «هەروەها فەرموویان لێتان بپرسم کە شیرینی ئەمڕۆتان بە دڵ بوو یان نا، فەرمووشی کە ئەو شیرینییەی ئەمڕۆ تاراس دروستی نەکردووە بەڵکوو نیکۆلاشا بۆ یەکەم جار دەستی بۆ هەویر بردووە و ئەگەرچی هەوەڵ دەستییەتی بەڵام خراپ لە کار دەرنەهاتووە، بەڵام نان سووخارییەکەی سووتاندووە.» ئێمە بەر لە فراوێن کەمتر یەکترمان دەدی. من بە تەنیا دەمامەوە و کتێبم دەخوێندەوە و پیانۆم دەژەنی و ئەویش نامەی دەنووسی یان هێندێ جار دەچووە دەرێ. بەڵام کاتژمێر چواری دوانیوەڕۆ لە ژووری نشیمەن کۆ دەبووینەوە. دایە گیان مەند و سەنگین لە ژوورەکەی دەهاتە دەرێ و قەیرە کچانی ئەشرافیی دەستتەنگ و ژنانی خوازەڵۆک کە هەمیشە دووسێ کەس لە ماڵی ئێمە بوون، کۆ دەبوونەوە و مێردەکەم بە پێی خەسڵەتی قەدیمی هەموو ڕۆژێک قۆڵی دەخستە قۆڵی دایکی و

دایکیشی لەسەر ئەوە پێداگر بوو من قۆڵم بخەمە قۆڵەکەی تری کوڕەکەی و هەڵبەت چوونە ژوورەوەی هەر سێکمان لە دەرگاکەوە نەدەگونجا و شانمان تێک دەترینجان. ئەوەشم لە بیر نەچێ دایەگیان هەمیشە لەلای ژووروویی مێزەکە دادەنیشت و سەروەریی خۆی دەنواند و ئاخافتنەکان زۆر ماقووڵانە بوون و دەبوو هێندێک فەرمی بن، بەڵام قسە سادە و ئاساییەکانی من و مێردەکەم زۆرجار فەرمی بوونی کۆڕەکەی تێک دەدا و چێژوخۆشیی پێ دەبەخشی. هێندێ جار دەمەقاڵێ لە نێوان دایک و کوڕدا ساز دەبوو و هەر کام بە گوێرەی گاڵتە پێکردن شتێکی بەوی دیکە دەگوت و من زۆرم چێژ لەو باس و دەمقڕانە وەردەگرت، چونکە خۆشەویستی و ئەشقی قووڵی هەردووکیان بۆ یەکتری لەو کاتە تایبەتانەدا دەردەکەوت. دوای فراوێن تاتیانا سمیۆنۆڤنا دەچوو بۆ ژووری میوانداری و لەسەر کورسییی دەستەداری خۆی دادەنیشت و گەردەی تووتنی دەساوییەوە یان پەڕەی ئەو کتێبانەی دەبڕی کە تازە بەدەستی گەیشتبوون و لێکی جیا دەکردنەوە و ئێمە بە دەنگی بەرز کتێبمان دەخوێندەوە بەڵام دڵخوازترین و چێژبەخشترین ڕابواردنمان ژەنینی پیانۆ بوو، کە هەر جارەی تارێکی تازەی دڵمانی دەلەراندەوە و دەتگوت دەرگای دڵمان سەر لە نوێ بۆ ئەشقی یەکتر دەکرێتەوە. هەر جارێک کە هەوای دڵخوازی ئەوم دەژەنی ئەو لەسەر قەنەفەیەکی دوور دادەنیشت، بە جۆرێک کە من نەمدەتوانی دەموچاوی ببینم و بە هۆی شەرمەوە هەوڵی دەدا کاریگەرییەک کە مۆسیقا لەسەر دڵی دادەنا و لە ڕوخساریدا ڕەنگی دەدایەوە، لە منی بشارێتەوە. بەڵام زۆر جار کە ئەو چاوەڕوانی ئەوە نەبوو هەڵدەستام و دەچووم بۆ لای و هەوڵم دەدا شوێنەواری هەیەجان و ترووسکەی سروشتیی چاوانی و دڵۆپی فرمێسکی قەتیس ماو لە نێویدا ببینم کە بێهوودە هەوڵی دەدا لە منی بشارێتەوە. دایکی زۆر جار دەیویست بێت بۆ هۆڵەکە و چاومان لێ بکات بەڵام لە ڕاستیدا دەترسا بێزارمان بکات و هێندێ جار کە وای دەنواند سەرنجی ئێمە نادات، بە شێوەیەک کە دەیویست جیددی بنوێنێ، بێ ئەوەی گوێ بە ئێمە بدات بە نێو هۆڵەکەدا تێدەپەڕی، بەڵام من دەمزانی هیچ کارێکی لە ژوورەکەی خۆی نییە و دەچێت و خێرا دەگەڕێتەوە. ئامادەکردنی چایی ئێوارە لەسەر من بوو و دیسان هەموو کەسانی بنەماڵە لە

ژووری میوانداری لە دەوری مێزەکە کۆ بووبوونەوە. ئەم کۆڕە فەرمییە لە دەوری سەماوەرێک کە وەک خۆر دەدرەوشایەوە و تێکردنی چایی و ناردنی پەرداخ و پیاڵە بۆ چایی خۆران هەتا ماوەیەک دەبووە هۆی بە خۆدا شکانەوەم. پێم وابوو هێشتا شایانی ئەو شانازییە نیم. جحێڵتر و هەرزەتر لەوە بووم کە شیاوی ئەوە بم لە سەماوەرێکی ئاوا جوان و گەورە چایی تێکەم و پەرداخی پڕ لە چایی بخەمە سەر کەشەفی نیکیتا و بڵێم بیبات بۆ پیووتێر ئیڤانۆڤیچ یان بۆ ماریا مینیچنا[١٤] و بپرسم «قەند مەیل دەفەرموون؟» پاشان چەند کلۆ قەند لە پاڵ پەرداخی پڕ لە چایی دایەنی بەساڵا چوو یان ئەو خزمەتکارانە دابنێم کە شایانی ڕێزگرتنی ئەربابەکانیان بوون. زۆرجار مێردەکەم دەیگوت: «ئەی بژیی! ئافەرەم! ڕاست وەک خاتوونێکی بەڕێز و مەند و ماقووڵ!» ئەوە زیاتر دەبووە هۆی شەرمەزار بوون و بەخۆدا شکانەوەم.

دوای چایی دایەگیان فاڵی پاستۆڕی دەگرتەوە یان گوێی بۆ ئەو فاڵە ڕادەگرت کە ماریا مینیچنا بۆی دەگرتەوە، پاشان ئێمەی ماچ دەکرد و خاچی دەکێشاین، تەبەڕوکی پێدەداین و ئێمە دەچووین بۆ هۆدەکەی خۆمان. بەڵام زۆربەی کات پێکەوە هەتا دوای نیوەشەو دادەنیشتین و نەدەخەوتین، ئەو بەخەبەر مانەوانەش باشترین و شیرینترین کاتەکانی ئەو ڕۆژەمان بوو. ئەو باسی ڕابردووی خۆی بۆ دەکردم یان گەڵاڵەمان بۆ داهاتوومان دادەڕشت یان هێندێ جار فەلسەفەڕێسمان دەکرد، دەستمان دەکرد بە قسەوباسی بێ بنەما و هەوڵمان دەدا بە هێواشی قسە بکەین تاکوو کەسانی قاتی سەرێ گوێیان لێ نەبێ و خەبەر بۆ تاتیانا سمیۆنۆڤنا نەبەن، چونکە خەسووم دەیویست ئێمە زوو بخەوین. شەوی وابوو برسیمان دەبوو و بە پێدزە دەچووین بۆ هەماری چێشتخانەکە و بە هاوکاریی نیکیتا شێوێکی ساردمان جێبەجێ دەکرد و لەبەر شۆقی کزی مۆمێک لە ژووری کارەکەی من دەمانخوارد. لەو ماڵە گەورە و بەرین و کۆنەدا کە ڕۆحی سەختگیری قەدیمی لە لایەن تاتیانا سمیۆنۆڤناوە سێبەری خستبووە سەر هەموو شتێکی، وەک غەوارە و نامۆ پێکەوە دەژیاین. بەڵام نەک هەر ئەو، بەڵکوو خزمەتکاران و ژنانی بە ساڵاچووی ڕێزدار و قەنەفە و وێنەی سەر دیوارەکانیش هەموویان

[١٤] Minitchna

ڕێزیان لە دڵمدا هەڵدەخڕاند و جۆرێک ترس و ئاگادارییان دەخستە مێشکمانەوە کە تێ بگەین من و مێردەکەم لێرە هاوڕەنگ نیین و نابەجێین و دەبێ زۆر بە وریایی و پارێزەوە بژیین و ئاگامان لە هەڵسوکەوتی خۆمان بێ. ئەمڕۆ کە بیر لەو کاتە و حاڵی خۆمان دەکەمەوە و دەبینم کە زۆر شت ـ نەزم و پارێز و هەڵسوکەوتی فەرمی کە بەسەر دارودیوار و مرۆڤی ئەم ماڵەدا زاڵ بوو، هەروەها تاقمی ئەو کەسانەی بێ کار و بێ بار هەمیشە ئامادەبوون لەم ماڵەدا ـ بارێکی زۆر قورس بوون لەسەر شانمان و ژیانی لێ تاڵ و دژوار کردبووین، بەڵام لەو کاتەدا هەر ئەو گرفت و کێشانە تەنووری ئەشقەکەمانیان بەتینتر دەکرد. نەک هەر من، بەڵکوو ئەویش، وای دەرنەدەخست کە نەزم و یاسای داسەپاوی زاڵ بەسەر ماڵەکەدا وەڕەزی کردووین و حەزی پێ نەکەین. بە پێچەوانە ئەو دەتگوت خۆی دەشارێتەوە تاکوو ئەو گیروگرفتانە نەبینێ. بۆ وێنە پێشخزمەتی خەسووم، دمیتری سیدۆرۆڤ[١٥] کە پیاوێکی بەنگی بوو، هەموو ڕۆژێ دوای فراوێن، کاتێک ئێمە لە هۆڵەکە بووین دەچوو بۆ ژووری کاری شووەکەم و تووتن و جگەرەی لێ دەدزی. ڕۆژێک سێرگی میخائیلیچ، بە حاڵەتێکی تێکەڵ بە ترس و شادییەوە بە پێدزکە هات بۆلام و بە قامک و چاو ئاماژەی کرد و چاوی قرتاند کە بێدەنگ بم و دمیتری سیدرۆڤی پیشان دام کە ئەو خۆی ڕۆحی لەوە ئاگادار نەبوو کە کەسێک چاوی لێ دەکا. سەیرەکەی لەوەدا بوو کاتێک دمیتری سیدرۆڤ لە ژوورەکە هاتە دەرێ و ڕۆیشت، چاوی بە ئێمە نەکەوت و پێی وانەبوو دیتوومانە، مێردەکەشم دڵی خۆش بوو کە کارەکە بەخێر گوزەراوە، منیش کە متەقم لە خۆم بڕیبوو، وەک هەمیشە کە لە کاتی وادا دەبووە هۆی ڕەزایەتی و کارەکەمی دەکەوتە بەر دڵ، ئافەرینی پێ گوتم و گوتیشی کە ژنێکی بێ وێنە و ژیرم و ماچی کردم. هێندێ جا ئەو هێمنی و ئامادەییەی بۆ لێبوردن، کە زیاتر لە کەمتەرخەمی و بێ موبالاتی دەچوو، نەدەکەوتە بەر دڵم. من بۆم دەرنەکەوتبوو کە خۆشم تۆوی ئەو کێشەیەم و ڕەفتاری مێردەکەم بە کەم غیرەتی و بێ موبالاتی دەزانی و لە دڵی خۆمدا دەمگوت ئەو ڕەفتارەی ئەو لە کاری منداڵێک دەچێ کە دەرەقەتی کردەوە و خواستی دەروونیی خۆشی نایەت.

---

[١٥] Sidorov

جارێک کە پێم گوت ئەو کەم غەیرەتی و بێ موبالاتییەی زۆر سەیرە بەلامەوە، وەڵامی دایەوە: ئاخ خۆشەویستەکەم، من بەو هەموو بەختەوەرییە کە بە نسیبم بووە چۆن دەتوانم لە شتێک ناڕازی بم؟ ماوەیەکە بەو ئاکامە گەیشتووم کە چاوپۆشی کردن ئاسانترە بۆم لە سزادان. هیچ بارودۆخێک نییە کە ببێتە کۆشپ لەسەر ڕێی بەختەوەریم. ژیانی ئێمە لێوڕێژە لە بەختەوەری و شیرینی! من ناتوانم ڕق لە کەسێک هەڵگرم یان لە کەسێک تووڕە بم. بەلای منەوە هەڵەیەک نییە کە بۆ لێبوردن نەبێ. هەڵەی خەڵکی هەمووی یان بۆ ڕابواردن دەبێ یان بەزەیی پێداهاتن. گرینگ ئەوەیە کە "چاکە" لە هەمبەر "چاکتر بوون" دا بەچۆکدا دێ. بڕوام پێ بکە کاتێک زڕەی جەڕەسی دەرگا بەرز دەبێتەوە، یان نامەیەکم بە دەست دەگا، یان کاتێک بەیانی لە خەو هەڵدەستم، خەیاڵێک بە مێشکمدا دێ و دڵم خەبەرم پێدەدا کە ژیان لە حاڵی گۆڕان دایە و لەوانەیە شتێک بگۆڕدرێ، ئەگەرچی دەبێ ئەوە بزانین کە باشتر لە ئێستامان مەحاڵە و دەبێ هەمیشە لە بیری ئێستاماندا بین.»

من بڕوام بە قسەکانی دەکرد بەڵام تێی نەدەگەیشتم. دڵخۆش بووم، بەڵام پێموابوو ژیان هەر ئەوەیە و نابێ جگە لە ئەوە بێ و هەمووان هەر ئاوان و تەنیا جاروبار بیرم دەکردەوە کە لە شوێنێک، ئەویش نازانم کوێ،بەختەوەرییەکی تر هەیە، بەڵام نەک وەک ئەم بەختەوەرییەی ئێمە، بەڵکوو لە شێوەیەکی تر.

دوو مانگ بەو شێوەیە تێپەڕی. زستان بەسەردا هات و سەرما و بەفر و سەهۆڵبەندان و بادەوە دەستی پێکرد، من ئەگەرچی لەگەڵ ئەو بووم بەڵام بەرەبەرە هەستم بە تەنیایی کرد. وردەوردە بۆم دەرکەوت ژیان دووپات دەبێتەوە و نە لە مندا شتێکی تازە سەر هەڵدەدا و نە لە ئەودا، بە پێچەوانە دەتگوت دەگەڕێینەوە بۆ بارودۆخی ڕابردوو. ئەو زۆربەی کاتەکانی بە کاروباری خۆی ڕادەگەیشت و کەمتر منی لە ڕەوتی کاروبارەکانی ئاگادار دەکرد. دیسان پێموا بوو لە ڕۆحی ئەودا جیهانێکی تر حەشار دراوە کە ئەو نایەوێ ڕێگای من بدات بچمە ناوی. ئەو نەرمی و هێمنایەتییە هەمیشەیییەی ئاراوقارای لێ هەڵگرتبووم. من ئەوم هەر وەک پێشوو خۆشدەویست و ئەشق و بەختەوەریم هیچ کەمایەتییەکی نەبوو، بەڵام ئەشق و هۆگریم لە زیاد بوونیش نەبوو و سەرەڕای ئەشق،

هەستێکی نامۆ و ئاڵۆزییەکی دەروونی دزەی کردبووە دڵمەوە و جاروبار تووشی دڵە خورپەی دەکردم. دوای ئەو بەختەوەرییەی کە بەرهەمی دڵدارییەکەم بوو ئیتر ئەشقی ئەو بە تەنیا تاسەی نەدەشکاندم. دڵم تاسەمەندی هەوڵ و جموجۆڵ بوو و ژیانی ئارام و ئاسوودە وەڕەز و دڵتەنگی دەکردم. حەزم لە هەیەجان و بە پیرەوە چوونی مەترسی دەکرد و لە دەرفەتێک دەگەڕام بۆ فیداکاری لە ڕێگای ئەشقدا. وزە لە دڵمدا کەلاوڕێژی دەکرد و دەیویست ببێتە سێلاو و ژیانی ئاراممان داگریێ. جاروباریش پەژارەیەک لەسەر دڵم بار دەبوو کە هەوڵم دەدا بە هەڵقوڵینی خۆشەویستی و نەشەی لە ڕادەبەدەر لە ئەوی بشارمەوە و هەر ئەوەش بووبووە هۆی ترس و نیگەرانی ئەو. ئەو بەر لەخۆم لە بارودۆخی ڕۆحیم تێگەیشتبوو و پێشنیاری پێکردم بچین بۆ شار. بەڵام من ڕێگام لەگەڵ دانەگرت و داوام لێکرد گۆڕانێک بەسەر باری ژیانماندا نەهێنین و ئەو بەختەوەرییەی خۆمان تێک نەدەین و هەر بە ڕاستیش بەختەوەر بووم. خەمی من تەنیا ئەوە بوو کە ئەم بەختەوەرییە بە ئاسانی و بەبێ هەوڵ و ئارەق ڕشتن لەلایەن منەوە مەیسەر بووبوو. هیچ لە خۆبردوویی و فیداکارییەکم بۆ نەکردبوو و وزەیەک کە دەبوو بۆ وەدەست هێنانی ئەم بەختەوەرییە سەرفم کردبێ، سەرفم نەکردبوو؛ یان ئەو هەلەم بۆ نەڕەخسا بوو سەرفی بکەم، بۆیە ئەو وزەیە خەریک بوو لە ناخەوە دەیپووکاندمەوە. ئەوم خۆش دەویست و دەمدی کە بۆ ئەو هەموو شتێکم و حەزم دەکرد هەمووان ئەوین و خۆشەویستیی ئێمە ببینن و وایان لێ بێ چاویان بەرایی نەدا و بە هۆی بەخیلییەوە کۆسپ و لەمپەر بخەنە سەر ڕێگامان و من سەرەڕای هەموو ئەو کۆسپ و گرفتانە هەروا خۆشم بوی و بیپەرستم. فیکر و خەیاڵ و هەستم هەمووی لەلای ئەو بوو، بەڵام هەستێکی تریش بوو کە وزەی گەنجێتی بوو و پێویستی بە جموجۆڵ و تێکۆشان بوو کە لەو ژیانە ئارامەی ئێمەدا جێگای نەبوو. بۆ گوتبووی هەر کاتێک من پێم خۆش بێ دەچین بۆ شار؟ ئەگەر ئەو قسەیەی نەکردبایە ڕەنگە تێگەیشتبایەم کە ئەم وزە پووکێنەرە هۆکارێکی نادروستە و بۆ دڵخۆشی و هێمنایەتیمان زیانبارە. ئەوەش تاوانی من بوو و ئەو دەرفەتەی کە بۆ لێبوردن و خۆ بەخشین بەدوایدا دەگەڕام ئامادە بوو. لەبەر چاوم بوو و ئەویش زاڵ بوون بوو بەسەر ئەو

هەستەدا. بیری ئەوەی کە دەمتوانی بە چوونە شار لەو خەفەتە ڕزگارم بێ نەخوازراوانە بەزەینم گەیشت بەڵام هەر لەو کاتەدا ویژدانم ڕازی نەدەبوو و کارێکی جوامێرانە نەبوو کە بۆ هێمنایەتیی حاڵی خۆم ئەو لەو ژیان و بارودۆخە دابڕم کە حەزی لێیەتی. کارێکی ئاواش نیشانەی نزمی و ڕەزیلی بوو. زەمان تێدەپەڕی و زستان لە کورتیی دەدا و بارستاییی بەفری بن دیوارەکانی ماڵێ دەهاتە سەرێ و ئێمە پێکەوە بووین و هەست و سۆزمان بۆ یەکتر لە کزیی نەدابوو، بەڵام هەر لەو کاتەدا لە شوێنێک کەسانێکی تر لە نوور و شادمانیدا ڕایان دەبوارد و خەریکی کەیف و نەهەنگ بوون، یان ئازاریان دەکێشا یان لە شادی و دڵەخورپەدا بوون، بێ خەبەر لە ئێمە و دوور کەوتەییمان. بۆ من لە هەموو شتێک خراپتر ئەوە بوو کە هەستم دەکرد لەگەڵ تێپەڕینی هەر ڕۆژێک خووخدەکانی ژیان زیاتر ڕیشە دادەکوتن و ژیانمان لە چوارچێوەی دیاری کراوی خۆیدا بەند دەکات. هەستی ئێمە ئیتر ئازاد نەبوو و سەرمان بۆ سووڕی یەکهاوی و خاڵی لە سەودای زمان دادەنەواند. سەر لە بەیانی بە کەیف و نەشە بووین و کاتی فراوێن بە ئەدەب و شەوانە مێهرەبان. لە دڵی خۆمدا دەمگوت: «چاکە، چاکە بۆ خەڵک و ژیان، ئەو گوتەنی، ژیان بە ڕاستی و دروستی و شەڕەفەوە. ئەمانە زۆر باش و پەسەندن. بەڵام بۆ ئەو جۆرە ژیانە دەرفەت زۆرە.» لەگەڵ ئەوەشدا هێندێ شت هەیە کە من تەنیا ئەمڕۆ دەتوانم دەستم پێی ڕابگا. من حەزم لەو جۆرە ژیانە نەبوو، ئەوەی من دەمویست خەبات و بەرەبەرەکانێ بوو. بە ئاواتەوە بووم دڵسۆزی و هەست ڕێنمای ژیانمان بێ نەک ئەوەی یەک ڕەواڵ بوونی ژیانمان هەستمان پێ ببەخشێ. حەزم دەکرد لەگەڵ ئەو بچمە سەر لێواری هەڵدێرێک، بە جۆرێک کە لەگەڵ هەڵێنانەوەی یەکەم هەنگاو بەرەو قووڵایی بەردەڵان و هەزاربەهەزار هەڵدێردرێم، یانی تەنیا بە جووڵانێک لە نێو بچم و هەر لەو کاتەدا ئەو، بە ڕەنگی پەڕیو و پەشۆکاوەوە، هەر لەوێ، لەسەر لێواری هەڵدێرەکە باوەشم پێدا بکات و بمگرێتەوە و نەهێڵێ هەڵدێردرێم، بە جۆرێک کە دڵم لە ترسانا بێ خود بێ و لەلێدان بکەوێ، ئەو کاتە ئەو بۆ هەر شوێنێک پێی خۆش بوو بمبا.

ئەو بارودۆخە بە ڕادەیەک تاڵ و دژوار بوو کە شوێنی لەسەر تەندروستیم دادەنا و هاوسەنگیی مێشک و دەروونی تێک دەدام. ڕۆژێک بەیانی حاڵم خراپتر لە باری ئاسایی بوو. ئەو بە تووڕەیی و نێوچاوانی گرژەوە هاتەوە بۆ ماڵێ و ئەوەش زۆر بە دەگمەن ڕووی دەدا. من لەڕێوە لەو حاڵەتە نائاساییەی تێگەیشتم و هۆیەکەیم لێ پرسی. بەڵام ئەو نەیدەویست هۆکاری تووڕە بوونەکەیم پێ بڵێ و خۆی لە وەڵام دانەوەی دەبوارد و گوتی شتێکی وانییە کە بایەخی باس کردنی بێ. دواتر بۆم دەرکەوت ملازمی پۆلیس، ڕەعیەتەکانی ئێمەی کۆ کردۆتەوە و لە ڕووی نەتەوی بوونەوە و نەیاری لەگەڵ مێردەکەم هەڕەشەی لێکردوون و بە شێوەیەکی نایاسایی داوای باج و سەرانەی لێکردوون. مێردەکەم هێشتا نەیتوانیبوو لەگەڵ ئەو پێشهاتە ناخۆشە ڕابێ و بە شێوەی ئاسایی ئەو ڕووداوە تەنیا بە شتێکی «بەزەیی بزوێن و پێکەنینی» بزانێ و هێشتا ڕقی لەدڵدا بوو و هەر بەو هۆیە نەیدەویست سەبارەت بەو کێشەیە لەگەڵ من بدوێ. بەڵام پێموا بوو بۆیە نایهەوێ ئەو مەسەلەیەم لەگەڵ باس بکات چونکە بە منداڵم دەزانێ و خۆشی لە تێگەیشتنی ئەو کێشەیە داما بوو کە لە زەینیدا پەنگی خواردبۆوە و پێوەی سەرقاڵ بوو. من ڕووم لێ وەرگێڕا و بێدەنگ بووم، پاشان داوام کرد ماریا مینیچنا بۆ چایی بانگ بکەن کە لە ماڵی ئێمە میوان بوو. چاییەکەم بە پەلەپەل خواردەوە و ماریا مینیچنام لەگەڵ خۆم برد بۆ هۆڵەکە و سەبارەت بە مەسەلەیەکی دێمودە کە قەتم گرینگی پێنەدەدا و بە هیچم نەدەزانی، بە دەنگی بەرز دەستم کرد بەقسە و دەمەتەقێ لەگەڵیدا. مێردەکەم لە ژوورەکەدا دەهات و دەچوو و جارجار چاوێکی لە ئێمە دەکرد و هەر ئەو ڕوانینانەی ئەو نازانم بۆ زیاتری ئیمان هەردە دەکردم و حەزم دەکرد بە دەنگی بەرز قسە بکەم، هەروەها ئەوەی ماریا مینیچنا دەیگوت هەمووی بەلامەوە قۆڕ و بێ تام بوون. مێردەکەم هیچی بە من نەگوت و ڕۆیشت بۆ ژووری کارەکەی خۆی و دەرگاکەی لەخۆی پێوەدا. هەر کە ئەو ڕۆیشت و زانیم ئیتر گوێم لە دەنگی نابێ، نەشە و شادیم بە تەواوی لە نێو چوو و هێندە گۆڕانەکەم کتوپڕ بوو کە میوانەکەم تێگەیشت و لێی پرسیم چیبووە؟ من وەڵامم نەدایەوە و لەسەر قەنەفەکە دانیشتم و بە دڵپڕی سەرم بەردایەوە و دەمویست بە دەنگی بەرز بگریم.

لە دڵی خۆمدا گوتم: «ئێستا چ خەیاڵێک لە مێشکیدایە؟ حەتمەن یەکێک لەو خەیاڵە پڕوپووچانە کە خۆی پێی وایە زۆر گرنگە. بەڵام ئەگەر بیهەوێ سەبارەت بە خەیاڵەکانی قسەم لەگەڵ بکات پێی دەسەلمێنم کە هەموو قۆڕیات و قسەی بێ مانایە. نا، ئەو پێویستی بەوەیە کە پێی وابێ من هیچ تێ ناگەم. پێویستیی بەوەیە کە بەو سەرساردی و کەمتەرخەمییە شاهانەیەی خۆی من سووک و چرووک بکات و بیسەلمێنێ کە هەمیشە هەق بە دەست ئەوە. باشە، کەوایە منیش کاتێک ژیان جاڕزکەر و خاڵی دەبێ بەلامەوە، کاتێک دەمەوێ زیندوو بم و ڕانەوەستم، لە شوێنێک دانەنیشم و چاو لە تێپەڕینی تەمەن بکەم، هەقم بە دەستە. من دەمەوێ بۆ پێشەوە بچم و هەموو ڕۆژ و سەعاتێک شتی تازە ببینم، کەچی ئەو دەیەوێ لە شوێنێک ڕاوەستێ و منیش لەگەڵ خۆی ڕاگرێ و ببێتە کۆسپ لەسەر ڕێی هەوڵ و تێکۆشانم. بۆ ئەو چ زەحمەتێکی هەبوو ئەگەر جووڵەیەکی بکردبایە؟ پێویست نەبوو حەتمەن بمبات بۆ شار. هەر ئەوەندە بەس بوو وەک من وابێ. خۆی ئازار نەدات و بەرگری لە خۆی نەکات و سادە و ئاسایی بژی. بە من دەڵێ سادە و ساکار بم کەچی خۆی سادە نییە. کێشەکەش لەسەر ئەوەیە.»

هەستم دەکرد هەر ئێستا فرمێسک بە چاومدا دێتە خوارێ. دڵم زۆر لێی پڕ بوو. ئەو ڕق و تووڕەییەی خۆم ترسی خستە دڵمەوە و چووم بۆ ژوورەکەی. لە پشت مێزەکەی دانیشتبوو و نامەی دەنووسی. کە ترپەی پێی بیستم سەری هەڵێنا و چاوێکی لێکردم و بە خوێنساردی و گوێ پێ نەدانەوە خۆی بە کارەکەی خۆیەوە خەریک کردەوە. من ئەو ڕوانینەیم بە دڵ نەبوو. بە جێی ئەوەی لێی نزیک ببمەوە لەبەر مێزەکەیدا ڕاوەستام و کتێبێکم لێک کردەوە و دەستم کرد بە چاو لێ کردنی. دیسان دەستی لە نووسین هەڵگرت و چاوی لێ کردم.

گوتی: «ماشا، دەڵێی تووڕەی؟»

وەڵامم نەدایەوە و تەنیا بە ساردی چاوێکم لە چاوی کرد کە ماناکەی ئەمە بوو «عەجەب پرسیارێک! گەورەییتان نواند کە وەبیرتان هاتەوە!» ئەو سەری لەقاند و بزەیەکی هاتێ کە بۆنی شەرمنی و خۆشەویستیی لێ دەهات، بەڵام بۆ یەکەم جار بوو کە بزەکەی بزەی نەخستە سەر لێوم.

پرسیم: «ئەمڕۆ چی ڕووی داوە؟ بۆچی بۆم ڕوون ناکەیتەوە؟»
وەڵامی دایەوە: «شتێکی گرینگ نەبوو. دەردەسەرێکی چکۆڵە بوو. ئەگەرچی ئێستا دەتوانم بۆت باس بکەم. دووکەس لە ڕەعیەتەکانیان ناردووە بۆ شار تاکوو...»
بەڵام من نەمهێشت ڕستەکەی تەواو بکات.
ـ«ئەی بۆ کاتی خواردنەوەی چایی لێم پرسیی وەڵامت نەدایەوە؟»
ـ«ئەو کاتە ڕقم هەستا بوو. دەترسام قسەی هەڵیتوپەڵیت لە دەمم دەرپەڕێ.»
ـ«بەڵام من ئەو کاتە دەمویست ئەو وەڵامە ببیستم.»
ـ«بۆ؟»
ـ«چونکە هەمیشە پێت وایە ناتوانم هیچ یارمەتییەکت بدەم و من دەمەوێ بزانم بۆچی وا بیر دەکەیتەوە؟»
قەڵەمەکەی دانا و گوتی: «چیت گوت؟ چیم پێ وایە؟ لە خۆڕا قسە دەکەی! من پێم وایە بەبێ تۆ ناتوانم بژیم. تۆ لە هەموو کارێکدا، باوەڕ بکە لە هەموو کارێکدا، نەک هەر یارمەتیم دەدەی، بەڵکوو هەموو کارەکان خۆت ئەنجامی دەدەی!» بە پێکەنینەوە درێژەی پێدا: «... ئەو قسەیەت لەو جۆرە قسەبە توێکڵانە بوو! من تەنیا لە سایەی تۆ و خۆشەویستییەکەتەوە زیندووم. من پێم وایە بۆیە کارەکان بە دەستمەوە دێن و دەڕۆنە پێشێ تەنیا لەبەر ئەوەی تۆ هاوڕێ و پشتیوانمی! بۆیە دەبێ...»
گوتم: «بەڵێ، ئەوە دەزانم. من تەنیا منداڵێکی وردیلە و بە نازونووزم کە خودا دایناوم بۆ هێور کردنەوەی تۆ و پێویستە هەبم بۆ ئەوەی تۆ بێ تاقەت نەبی!» ئەوەشم بە لەبزێک دەربڕی کە زۆر سەری سووڕما. بە جۆرێک کە دەتگوت یەکەم جارە دەمبینێ یان چاوم لێ دەکات. گوتیشم: «من نامەوێ ڕۆڵی هێور کەرەوەم هەبێ. تۆ بە ڕادەی پێویست ئاسوودەی. تەنانەت لە ڕادە بەدەریش!»
بە تاڵووکە پەڕییە نێو قسەکانم: «باشە، دەزانی چی؟ مەسەلەکە هەر ئەوەیە و من دەمەوێ بزانم بیروڕای تۆ چییە!» قسەکەی پێ بڕیم تاکوو نەهێڵێ ئەوەی لە دڵمدایە بیدرکێنم.

من وەڵامم دایەوە: «ئێستا ئیتر نامەوێ!» هەرچەند زۆر حەزم دەکرد گوێم لە قسەکانی بێ، بەڵام زیاتر دەمویست بیشڵەژێنم و هێمنایەتییەکەی لێ تێک بدەم. گوتم: «نامەوێ ڕۆڵی بوونەوەرێکی زیندوو بگێڕم. دەمەوێ بە ڕاستی بژیم. وەک تۆ!»

حاڵی دڵی لە ڕوخساریدا بە خێرایی و بە ڕوون و ئاشکرایی ڕەنگی دایەوە و شوێنەواری ئازار و گرنگایەتییەکی زۆر سەری هەڵدا.

ـ«من دەمەوێ بژیم. شان بە شانی تۆ، لەگەڵ تۆ...»

بەڵام نەمتوانی ئەوەی لە دڵمدا بوو دەریبڕم. چونکە شوێنەواری خەمێکی قورس و زۆر قووڵ لە ڕوخساریدا وەدیار کەوت. تۆزێ بێدەنگ بوو.

گوتی: «لە کام بواری ژیاندا لەگەڵ من یەکسان نیی؟ لەوەدا کە لەگەڵ ملازمی پۆلیس و مووژیکە مەستەکان دم بە دمە ناکەی؟»

گوتم: «نا، نەک هەر لەوەدا!»

درێژەشی پێدا: «تۆ خودا، خۆشەویستەکەم، هەوڵ بدە تێبگەی! دەزانم نیگەرانی بەڵایەکە کە هەمیشە دەبێتە هۆی ئازارمان. ئەوەش شتێکە کە ئەزموونی ژیان فێری کردووم. من تۆم خۆش دەوێ و وەک ڕۆژیش ڕوونە کە بە گیان و دڵ حەز دەکەم خەم و نیگەرانی لە تۆ دوور بخەمەوە! ژیانی من هەر بەوەوە بەندە. من بە ئەشق و خۆشەویستیی تۆوە دەژیم و ماوم. کەوایە لێگەڕێ با بژیم و ئاشقت بم!»

من بێ ئەوەی چاو لە چاوی بکەم گوتم: «بەڵێ، تۆ هەمیشە هەقت بە دەستە!»

ڕقم هەستا بوو کە دەمدی دیسان ڕۆحی پڕاوپڕە لە ڕووناکی و ئاسوودەیی و هەر لەو کاتەدا منیش ڕق و قین لە دڵم هەڵدەقوڵا و هەستێکی وەک پەشیمانی لە ناخەوە هەڵیدەچۆقاندم.

گوتی: «ماشا، چی بووە؟ بۆ وادەکەی؟ خۆ باس لەسەر ئەوە نییە هەق بە دەستی کێیە و کێ خەتا بارە. کێشەکە شتێکی دیکەیە. چ شتێکی من بە پێی مەیلی تۆ نییە؟ پێویست ناکا خێرا وەڵام بدەیتەوە. بیربکەوە. بیر بکەوە و پاشان هەرچی لە دڵتدا بوو پێم بڵێ. تۆ لە من ڕازی نیی. حەتمەن مافی ئەوەشت هەیە کە ڕازی نەبی. بەڵام پێم بڵێ، پێم بڵێ خەتای من چییە؟»

بەڵام من چۆن دەمتوانی ئەوەی لە دڵمدایە دەریبڕم؟ ئەو دیسان بێ ئەوەی بڵێ من، لەڕێوە هەموو شتێک تێگەیشتبوو. من دیسان لە هەمبەر ئەودا منداڵێک بووم و نەمدەتوانی کارێک بکەم کە ئەو تێ نەگات یان لانی کەم لە پێشدا نەزانێ، هەر ئەمانەش دەیان شڵەژاندم و زیاتر پەڕێشانیان دەکردم.

گوتم: «من هیچ سکاڵایەکم لە دەست تۆ نییە. تەنیا بێ وازییەک لەشی داگرتووم و دەمەوێ خۆی لە چنگ دەرباز بکەم. تۆ دەڵێی هیچ چارەیەک نییە و دیسان هەق بە دەست تۆیە!»

ئەوەم گوت و چاوێکم لێکرد، دیتم بە مەبەستەکەم گەیشتووم و ئەو تووشی ئاڵۆزی بووە و هێمنایەتییەکەی لە دەست داوە، بە ئاشکراش ترس و ئازار لە ڕواڵەتیدا دەبینرا.

بە دەنگێکی ئارام و لەبزێکی شێواو گوتی: «ماشا، ئەم کارەی ئێمە گاڵتە نییە. چارەنووسی ئێمە لەم ساتەدا مەعلووم دەبێ. داوات لێدەکەم جوابەجەنگی نەکەی و تەنیا گوێ شل بکەی. پێم بڵێ، بۆ دەتەوێ ئازارم بدەی؟»

بەڵام من پەڕیمە نێو قسەکانی و گوتم: «دەزانم تۆ هەر شتێک بڵێی هەر هەق بەلای تۆدا دەشکێتەوە.» قسەکەم ساردوسڕیی پێوە دیار بوو، بە جۆرێک کە دەتگوت من نیم قسە دەکەم بەڵکوو ڕۆحێکی ناپاک بوو کە لە زمانی منەوە قسەی دەکرد.

بە دەنگێکی لەرزۆک گوتی: «خۆزگە تێگەیشتبایەی چی دەڵێی!»

من دەستم کرد بە گریان و ئەو گریانە باری دڵی سووک کردم. ئەو لە پاڵمدا دانیشتبوو و قسەی دەکرد. دڵم پێی دەسووتا و شەرمەزاریش بووم، هەروەها ڕقم لە خۆشم هەستا بوو. چاوم لە ئەو نەدەکرد. پێموا بوو لەو ساتەدا ئەو بە تووڕەیی یان سەرسووڕمانەوە لێم دەڕوانێ. سەرم وەرسووڕاند. نیگای گەرم و پڕ لە سۆز و خۆشەویستیی دەتگوت بۆ داوای لێبوردن لە منی بڕیوە. دەستیم گرت و گوتم: «لێم ببوورە، من خۆشم نازانم دەڵێم چی.»

گوتی: «بەڵام من دەزانم. تۆ ڕاست دەکەی!»

پرسیم: «چۆن؟ چی ڕاست دەکەم؟»

گوتی: «دەبێ بچین بۆ پترزبۆرگ. لێرە هیچ کارێکمان نییە.»

گوتم: «هەر چۆنێک تۆ بە باشی دەزانی!»

باوەشی پێدا کردم و لەگەڵ ئەوەی ماچی کردم گوتی: «بمبوورە، من خەتام دەرهەق بە تۆ کردووە.»

ئەو شەوە من ماوەیەکی زۆر پیانۆم ژەنی ئەو بەردەوام لە نێو هۆڵەکەدا هاتوچۆی دەکرد و لەبەر خۆیەوە شتێکی دەگوت. خەسڵەتی وابوو لەبەر خۆیەوە قسەی دەکرد و من زۆر جار لێم دەپرسی کە چی دەڵێ، ئەو بیری دەکردەوە و ڕاست ئەوەی لەبەر خۆیەوە گوتبووی بۆ منی دووپات دەکردەوە و قسەکانی زیاتر شێعر بوون و هێندێ جاریش قسەی هەڵیتوپڵیت و سەیر، بەڵام من هەر بەو قسانەیدا لە حاڵی دەروونی دەگەیشتم. پرسیم: «ئەمڕۆ بۆ لە لەبەر خۆتەوە هەر دەمنجێنی؟»

ڕاوەستا و تۆزێ بیری کردەوە و بسکەی سمێڵی هات، ڕووی تێکردم و ئەم دوو دێڕە شێعرەی لێرمانتۆڤی[١٦] خوێندەوە:

**ئەو لەبەر تۆفان دەپاڕێتەوە و**

**ئاشتیی لێی دەوێ**

**بەڵام ڕەشە با ئاشتی ناناسێ![١٧]**

من لە دڵی خۆمدا گوتم: نا، ئەو لە مرۆڤ باڵاترە. هەموو شتێک دەزانێ. چۆن دەکرێ خۆشت نەوێ!

هەستام دەستیم گرت و پێکەوە دەستمان کرد پیاسە کردن و هەوڵم دەدا هەنگاوەکانم لەگەڵ ئەو ڕێک بخەم.

بە پێکەنینەوە چاوی لێکردم و پرسیی: «باشە؟»

بە سرتە گوتم: «باشە!» شادی و نەشە لە دڵمان هەڵدەقوڵا. چاو و لێومان بزەی تێگەڕابوو و هەنگاوەکانم خێراتر و بەرزتر بۆوە و جار لەگەڵ جار زیاتر بە نووکی پەنجە دەڕۆیشتین و هەر بەو شێوەیە بە نێو هەموو ژوورەکاندا تێپەڕیین و لە ژووری نان خواردن ڕاوەستاین. بە دەنگی بەرز پێدەکەنیین، بە

---

[١٦] LERMANTOV

[١٧] لە شێعری بایەوان

**جۆرێک کە گریگۆری بەو ئاکار و هەڵسوکەوتەی ئێمە ڕقی هەستا و دایە گیان، کە فاڵی پاستۆڕی دەگرتەوە تووشی سەر سوڕمان بوو.**
**دوو حەوتوو دواتر، ڕاست بەر لە جێژن لە پترزبۆرگ بووین.**

## حەوت

**سەفەری ئێمە بۆ پترزبۆرگ و حەوتوویەک مانەوەمان لە مۆسکۆ و سەردانی خزم و کەسەکانی ئەو و کەسوکارەکانی من و نیشتەجێ بوون لە باڵەخانەیەکی نوێ، بەسەرهات و ماجەرای ڕێگا، ئەو شارانەی پێشتر نەمان دیبوون، ڕوخساری تازە، هەمووی، هەر وەک لە خەودا دیبێتمان، هێندە ڕەنگاوڕەنگ بوون و تازە بوون بە لامانەوە، نەشەی دەبزواندین و دەبووە هۆی ئەوەی ئەشق لە نێو دڵمدا بڵێسەی بکێشێ و هێندە گەرم و پڕشنگدار بوو کە ژیانی هێمنی گوند لەبەر چاوم شتێکی بێ بایەخ و تایبەت بە ڕابردوو بوو. زۆرم پێ سەیر بوو، بەجێی ساردوسڕییەک کە لە لایەن کۆمەڵگای گەورانەوە چاوەڕوانیم لێی هەبوو، دەمدی هەمووان (نەک هەر خزم و کەسەکان، بەڵکوو نەناسیاوەکانیش) دەرهەق بە من ڕووخۆش و دڵۆڤان و سادق بوون، بە جۆرێک کە دەتگوت تەنیا بیر لە من دەکەنەوە و چاوەڕوانی گەیشتنی من بوون تاکوو شادی و ڕابواردنەکەیان کامڵ بێ. ئەوەی سەیر بوو بەلامەوە ئەوە بوو کە مێردەکەم لە کۆڕی گەوراندا، ئەویش لە نێو کەسانی هەڵکەوتەدا دۆست و ئاشنای وای هەبوو کە قەت باسی ئەوانی بۆ نەکردبووم و زۆر بەلامەوە سەیر و ناخۆش بوو کە سەبارەت بە هێندێکیان، کە بە بڕوای من زۆر مێهرەبان و شایان بوون، بە خراپە باسی دەکردن. تێ نەدەگەیشتم بۆچی لەگەڵ ئەوان ئاوا بە ساردوسڕی هەڵسوکەوت دەکات. خۆی لە زۆربەی ئەو ناسیاوانە دەبوارد کە بە بڕوای من بەڕێز و تەنانەت جێگای شانازیش بوون. من پێموا بوو هەر چەند زیاترمان لەو دۆست و ناسیاوانە هەبێ باشترە. چونکە هەمووان لەگەڵ من سەروڕووخۆش بوون.**

بەر لەوەی لە گوندەوە بەرەو شار وەڕێ بکەوین پێی گوتبووم: «دەزانی دەبێ چبکەین؟ ئێمە لێرە،یانی  لە گوند دەکرێ بڵێین دەوڵەمەندین. بەڵام لەلای ساماندارانی شار زۆر هەژار دێینە ئەژمار. بۆیە وا باشە تەنیا هەتا حەوتووی پیرۆز (چەژنی پاک) لە شار بمێنینەوە و سەر بە کۆڕ و کۆبوونەوەی گەورە و خانەدانەکاندا نەکەین. چونکە دەبێتە هۆی دەردەسەری بۆمان. بۆ تۆش هیچ حەزم لێ نییە کە...»

من گوتبووم: «چکارمان بە کۆڕ و کۆبوونەوەی گەوران داوە. تەنیا سەرێک لە شانۆکان دەدەین و سەردانی خزم و کەسانی خۆمان دەکەین یان هێندێک دەچین بۆ ئۆپێرا و گوێ لە مۆسیقای باش دەگرین و هەتا جێژنی پاکیش لەوێ نامێنینەوە و زوو دەگەڕێینەوە.»

بەڵام کاتێک گەیشتینە پترزبۆرگ ئەم پلانانەمان هەموو لەبیر چۆوە. من لە ناکاو خۆمم لە شوێن و ئاقارێکی تازە و خۆش دییەوە کە زۆرم بە دڵ بوو، هێندە شادمانیی تازەم بەسەردا ڕژا و کەوتمە نێو دەریای مەیل و هۆگریی تازەوە کە دەستەوبەجێ نەک لە ڕووی ئاگادارییەوە، بەڵکوو بێ ئیختیار حاشامان لە تەواوی ڕابردوو و قەرار و بەڵێنەکانمان بۆ داهاتوو کرد و وازمان لێ هێنان. هەموو لەبەر چاوم وەک گاڵتە و ڕشقنجاڕ دەچوون. دەسپێکێک بوون بۆ ژیانی ڕاستەقینە و لە ڕاستیدا تازە لەگەڵ ژیانی ڕاستەقینە بەرەو ڕوو بووبووم و ئەو مزگێنییە فریودەرانەی کە بۆ داهاتوو پێی دەدام تازە لەگەڵی بەرەوڕوو بووبووم. نیگەرانی و سەرەتای خەمۆکی کە لە گوند ئازاری دەدام دەتگوت بە جادوویەکی کتوپڕ هەمووی لەنێو چووە. خۆشەویستیی مێردەکەم گڕ و بڵێسەی دامرکایەوە و ئیتر قەت تووشی ئەو دڕدۆنگییە نەدەبووم کە پێموابێ گڕی ئەشقی لە دڵمدا دامرکاوەتەوە یان تین و گەرمییەکەی کەم بۆتەوە. دڕدۆنگییەکی ئاوا نەیدەتوانی لە دڵمدا سەر هەڵبدا، چونکە مێردەکەم لەڕێوە لە هەموو بیر و خەیاڵەکانم تێدەگەیشت و بەشداری هەموو هەستەکانم بوو و هەموو خواست و ئاواتەکانمی بەجێ دێنا. ئەو هێمنایەتی و ئاسوودەیییەی لە گوند هەیبوو، لێرە هەمووی لە نێو چووبوو، یان دەکرێ بڵێم ئیتر ئازاری نەدەدام. جگە لەوەش سەرەڕای ئەوەی وەک ڕابردوو خۆشی دەویستم، هەستم دەکرد لە ناخی دڵەوە ئافەرینم پێ دەڵێ

و زۆر جار دوای گەڕانەوە لە میوانی یان پاش چاوپێکەوتنی ئاشنایەکی تازە، یان دوای بەڕێوەچوونی میوانییەک لە ماڵەکەمان، کە من زۆر بە ترس و لەرز و دڵەخورپەوە ئەو کاتانەم تێدەپەڕاند و ئەرکی خاتوونی ماڵێم بەجێ دێنا و ترسی ئەوەشم بوو تووشی هەڵەیەک بم، دەیگوت: «ئافەرەم کچی باش، زۆرم بە دڵ بوو! بۆ شەرم دەکەی؟ بۆ بڕوات بە خۆت نییە؟ باوەڕ بکە کارەکەت زۆر باش بوو!» منیش هێندێ جار بەو تاریف و پیاهەڵدانانەی گەزگەز باڵام دەکرد و دەگەشامەوە. ماوەیەک دوای ئەوەی لە پترزبۆرگ نیشتەجێ بووین نامەیەکی بۆ دایکی نووسی و داوای لە منیش کرد لە داوێنی نامەکەدا چەند وشەیەک بنووسم، بەڵام نەیدەهێشت ئەوەی خۆی نووسیویەتی بیخوێنمەوە. هەڵبەت من زۆرم پێداگری کرد کە لێم گەڕێ نامەکەی بخوێنمەوە و خوێندمەوە. نووسیبووی: «دایە گیان، بڕوا بکە ئەگەر ماشا ببینی نایناسییەوە. لەبەر چاوم بۆتە مرۆڤێکی تر. سەرم سووڕ ماوە کە ئەو ڕووخۆشی و بڕوا بە خۆ بوون و توانایی و خۆڕێکخستن و ئاسوودەیییەی کاتی هەستان و دانیشتن و ئاخافتن لەگەڵ گەورە و خانەدانەکان لە کوێوە فێر بووە. ئەو هەڵسوکەوت و ئاکارانەی لەو پەڕی ساکاریدایە و دڵپاکی و مێهرەبانی تێیدا شەپۆل دەدا. هەمووان بە ڕێزەوە لێی دەڕوانن و خۆشیان دەوێ و من خۆشم ئەوەندەی پێی هەڵبڵێم هێشتا هەر کەمە و ئەگەر خۆشەویستیم بۆ ئەو ئێستا لە ڕادەبەدەر نەبووایە، لەوەش زیاترم خۆش دەویست، یانی دەبێ بڵێم خۆشەویستیی ماشا بە هیچ شتێک پێوانە ناکرێ.»

لە دڵی خۆمدا گوتم: «سەیرە، کەوایە من ئاوام!» بۆیە گەشامەوە و شادی و نەشە ناخ و دڵی داگرتم و تەنانەت بۆم دەرکەوت زۆر زیاتر لە پێشوو خۆشم دەوێ. سەرکەوتنم لە وەدەست هێنانی دڵی دۆست و ناسیاواندا بەلامەوە شتێکی تازە بوو. لە هەموو لایەکەوە پێیان دەگوتم خاڵە گیان زۆری من خۆش دەوێ یان پووری گیان دڵ و گیانی لەلامە و خەریکە بۆم شێت دەبێ. کەسێک پێی دەگوتم کە لە نێو خاتوونەکانی پترزبۆرگدا بێ وێنەم و یەکێکی تر دڵنیای دەکردم کە ئەگەر بمهەوێ دەتوانم ببمە سەرەژنی هەموو کۆڕەکان و ئەستێرەی ئاسمانی پترزبۆرگ. بە تایبەت پوورزای مێردەکەم "پرەنس.د"، ژنێکی نیمچە گەڕاوە بوو و لە زۆربەی کۆڕ و میوانییەکاندا بەشداریی دەکرد، هەر لە یەکەم چاو پێکەوتنیەوە هۆگرم

بوو و لە هەمووان زیاتر ڕێزی بۆ دادەنام و دڵخۆشی دەکردم، قسەکانیشی هێندە شیرین بوو پێی دەگەشامەوە. یەکەم جار کە ئەو پوورزایەی سێرگی میخائیلیچ منی بانگهێشتن کرد بچم بۆ کۆڕی سەما و لەو بارەوە لەگەڵ مێردەکەم قسەی کرد، ئەو بە بزەیەکی تا ڕادەیەک فێڵەبازانەوە لێی پرسیم کە حەزم لێیە بچم؟ منیش بە نیشانەی ڕەزایەت سەرم لەقاند و هەستم کرد کە ڕەنگم سوور هەڵگەڕاوە.

مێردەکەم بە پێکەنینێکی شیرینەوە گوتی: «کاتێک دان بە شتێکدا دەنێ کە حەزی لێیەتی وەک ئەوە وایە تاوانێکی ئەنجام دابێ!»

بە بزەیەکەوە و بە نیگایەکی پڕ پاڕانەوە چاوم لێکرد و وەڵامم دایەوە: «خۆت گوتت ئێمە نابێ هاتوچۆی کۆڕ و دانیشتنی خانەدانەکان بکەین و خۆشت هۆگری ئەو چەشنە کۆڕانە نییت.»

ـ«ئەگەر بە ڕاستی حەزت لێیە دەچین.»

ـ«ڕاستییەکەی ئەمەیە کە واباشترە نەچین.»

دیسان پرسیی: «هەر بە ڕاستی حەزت لێیە؟ زۆرت حەز لێیە؟»

من وەڵامم نەدایەوە.

ئەو درێژەی پێدا: «ئەم جۆرە کۆڕانە خۆیان زۆر خراپ نین. ئەو ویست و ئاواتانەی لەوێدا سەر هەڵدەدەن و مرۆڤ پێی ناگات و تێدا ناکام دەبێ کارەکان خراپ دەکا، بۆیە پێم وایە هەم زیانبەخشە و هەم کارێکی دزێویشە.» لێبڕاوانە گوتیشی: «حەتمەن دەبێ بچین و دەچین.»

گوتم: «ئەگەر ڕاستت دەوێ هیچ شتێک لە دنیادا نییە کە ئەوەندە حەزی پێ بکەم.»

چووین بۆ کۆڕی سەما و میوانداررییەکە و ڕەزایەتێک کە هەستم پێکرد زۆر لە ڕادەی چاوەڕوانیمی تێپەڕاند. لەم کۆڕەدا زیاتر لە پێشوو هەستم کرد کە ناوەندێکم و هەموو شتێک بە دەوریدا دەسووڕێتەوە. هەستم کرد کە ئەو هۆڵە پڕ لە گوڵ و تیشکەیان تەنیا لەبەر من ڕازاندۆتەوە و ئۆرکێسترا بۆ من پرۆگرام دەگێڕێ و ئەو تاقمەی کە شەیدای منن تەنیا بۆ ستایش کردنی من کۆبوونەتەوە. هەمووان، لە جوانکار و کچانی خزمەتکارەوە بگرە هەتا سەماکاران و تەنانەت

ئەو بە ساڵاچووانەی لە نێو تەلارەکەدا دەگەڕان هەموویان پێیان دەگوتم یان تێیان دەگەیاندم کە خۆشیان دەوێم. داوەریی گشتی میوانەکانی ئەم کۆڕە پڕشکۆیە سەبارەت بە من، هەر وەکوو پوورزای مێردەکەم بۆی باس کردم ئەمە بوو کە من هیچ وێکچوونێکم لەگەڵ ژنانی تر نییە. شتێکی تایبەت لە مندا هەیە کە ڕەنگ و بۆنی لادێیی پێوەیە و زۆر سادە و سەرنج ڕاکێش و دڵڕفێنە. ئەم سەرکەوتنە بە ڕادەیەک بۆ من دڵ بلاوێن و شیرین بوو کە ڕاشکاوانە بە مێردەکەمم گوت کە لەو ساڵەدا دوو یان سێ جاری دیکە بچین بۆ ئەو کۆڕی سەما و میواندارییانە و گوتیشم کە «بە تایبەت لەبەر ئەوەی کە بە باشی لێی تێر بم.» ئەوەم گوت بەڵام خۆشم دەمزانی بە ڕاستیم نییە.

مێردەکەم بە مەیلی خۆی ڕازی بوو و سەرەتا بە تامەزرۆییەکی ئاشکراوە هاوڕێیی دەکردم و بە درەوشانەوەی من لە کۆڕەکاندا زۆر خۆشحاڵ دەبوو و دەتگوت ئەوەی لە ڕابردوودا گوتبووی لە بیری بردۆتەوە یان حاشای لێ دەکا.

بەڵام دواتر دیار بوو کە ئەو جۆرە ژیانە زۆر جاڕزکەر بوو بۆی و بە دژواری دەیتوانی تاملی بکات. بەڵام من مەستی درەوشانەوە بووم و هەقم بەسەر حاڵی ئەوەوە نەبوو و ئەگەر هێندێ جاریش بۆم دەردەکەوت بە شێوەیەکی جیددی چاوم لێدەکات و چاوم لەسەر هەڵناگرێ، لە مانای ڕوانینەکانی تێ نەدەگەیشتم. ئەوەی کە من بە شەیداییم دەزانی و لە ناکاو لە دەروونی هەموو غەوارە و نەناسیاوەکاندا بڵێسەی کێشا بوو، ئەم دۆخی لێ کاڵانەوە و ناسکی و ڕەزایەت و تازەیییەی شتی نەدیتراو، کە لێرە بۆ یەکەم جار هەناسەم تێدا دەکێشا، وەها سەرنجی ڕاکێشا بووم و کارتێکەرییەکی ڕەفتاری کە ئەو هەمیشە منی پێ ورد کردبوو، لێرە لەناکاو وەها بە تەواوی لە نێو چووبوو و لە ئاکامدا نەک چێژی یەکسانی لەگەڵ ئەو، بەڵکوو تەنانەت خۆ لە ئەو بە زیاتر زانین، وەها خۆشەویستیمی دەرهەق بە ئەو بەتینتر و ئازادتر لە ڕابردوو کردبوو کە نەمدەتوانی تێبگەم ژیان لە نێو خانەدان و درەوشانەوە لە کۆڕەکانیاندا چ شتێکی پێوەیە کە بە بڕوای ئەو بۆ من نەشیاوە. هەر جارێک کە دەچووینە کۆڕێک و من سەرنجی هەموو چاوەکانم بۆ لای خۆم ڕادەکێشا و هەستی غوروورێکی تازە لە ناخمدا سەری هەڵدەدا و شاییم بە خۆم دەهات، ئەو وەک

ئەوەی لەو خۆ بە خاوەن کردنەی من شەرمەزار بێ، لەڕێوە منی بەجێ دەهێشت و لەنێو ئاپۆرەی فراکە ڕەشەکاندا بزر دەبوو. زۆرجار بە قەڵافەتی ناڕوون و ڕوخساری بە ئاشکرا مەلوولی ئەوم لەو بەری تەلارەکە دەدۆزییەوە و لە دڵی خۆمدا دەمگوت: «ڕاوەستە، ڕاوەستە، با بگەینەوە ماڵێ جا ئەو کاتە تێدەگەی و دەزانی بۆ کێ هەوڵ دەدەم خۆم برازێنمەوە و دەدرەوشێمەوە و چ شتێک لەوانەی ئەمشەو لە دەوروبەرمە زیاتر بۆ من سەرنج ڕاکێشە و حەزی پێ دەکەم!» سادقانە پێم وابوو لەو درەوشانەوە و بەر چاوبوونەم لە نێو گەوراندا تەنیا لەبەر خاتری ئەو چێژ وەردەگرم، تەنیا لەبەر ئەوەی بتوانم ئەو سەرکەوتنەی خۆم فیدای ئەو بکەم و بیخەمە ژێرپێی. پێموایە تەنیا زیانێک کە ژیان لە نێو کۆمەڵگای گەوراندا لەوانەیە بۆ من هەیبێ گریمانەی ئەوەیە کە ئاشقی یەکێک لەو پیاوانە بم کە لەگەڵم ناسیاوی پەیدا دەکەن و مێردەکەم پێی دەرهەڵدە بێ و غیرەتی قەبووڵ ناکا. بەڵام ئەو ئەوەندەی متمانە بە من هەبوو و بەڕادەیەک لەو بابەتەوە ئاسوودە و دڵ حەساوە بوو کە هەستی دڵپیسی و خانەگومانی لەلای بێ مانا بوو. ئەو گەنجانەی لە دەوروپشتی من بوون لەچاو ئەو هێندە سووک و کەم بایەخ بوون کە ئەو تەنیا مەترسییەی کۆڕی خانەدانەکان زۆر لەبەر چاوم بێ بایەخ بوو. لەگەڵ ئەوانەشدا چێژم لە سەرنج و چاوی تامەزرۆی ئەو هەموو پیاوانەی کۆڕەکە وەردەگرت و شایی بەخۆ بوونەکەم زیاتر دەبوو و ئەو بیرە مێشکی دادەگرتم کە ئەوین و خۆشەویستیی مێردەکەم بێ هوودە نییە و متمانەم پێ دەبەخشێ و دەکرێ بڵێم هەڵسوکەوتم لەگەڵ ئەو تۆزێک کەمتەر خەمی و بوێریی لەخۆ گرتبوو.

ڕۆژێک کە لە کۆڕی سەما دەگەڕاینەوە قامکێکم بە نیشانەی وریایی پێدان بۆ لای ڕاداشت و گوتم: «ئەمشەو دیتم چاک لەگەڵ "خاتوو ن.ن." قسەت گەرم کردبوو.» ئەو "خاتوو ن.ن."یە یەکێک لە ژنە جوان و بەناو بانگەکانی پترزبۆرگ بوو و مێردەکەم بە ڕاستی ئەو شەوە سەری قسەی لەگەڵ کردبۆوە و ئەوەم گوت کە ئەو بوروژێنم چونکە لەڕادەبەدەر بێدەنگ بوو و بێ تاقەت و وەڕەزی دەنواند.

نێوچاوانی گرژ کرد و ددانی بەیەکدا نا، وەک ئەوەی لەبەر ژانێکی جەستەیی لەخۆی نووسابێ، گوتی: «ئاخ، ئەوە چ قسەیەکە دەیکەی ماشا! یانی بۆ ئەوە

دەبێ زیادە لە هەموو کەس تۆ ئەو قسەیە بە من بڵێی؟ ئەم قسەیە بەڕاستی لەگەڵ بارودۆخی ئێمە سازگار نییە و لە تۆ ناوەشێتەوە؛ ئەو قسەیە دانێ بۆ کەسانێکی تر. ئەو وتە بێ تام و درۆیینانە لەوانەیە ئەو پێوەندییە قووڵ و پاکەی لە نێوان ئێمەدا بوو تووشی ڤەشەل بکات کە هیوادارم ڕۆژێک دیسان ئەو ئەشق و گەرموگوڕییە لە نێوانماندا بژییێتەوە.»

من هەستم بە شەرمەزاری کرد و بێدەنگ بووم.

پرسیی: «ئێستا پێت وایە بژییێتەوە، ماشا؟ بیروڕای تۆ چییە؟»

گوتم: «پێوەندیی ئێمە گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە و سارد نەبۆتەوە و قەتیش ناگۆڕدرێ.» ئەو کاتە هەر واشم بیر دەکردەوە.

گوتی: «خودا بکات وابێ. پێموایە کاتی ئەوە هاتووە لە بیری ئەوە دابین بگەڕێینەوە بۆ گوند. وانییە؟»

بەڵام ئەو تەنیا جارێک بەو شێوەیە نارەزایەتیی خۆی دەربڕی. هەمیشە پێموابوو ئەویش بە ڕادەی من دڵخۆش و شیرین کامە، چونکە من بە ڕاستی دڵخۆش و بە کەیف بووم و دڵخۆشیی خۆم دەدایەوە کە ڕاستە جارجار هەست بە وەڕەزی دەکات، بەڵام منیش لە گوند لەبەر خاتری ئەو کەمم هەست بە وەڕەزی نەدەکرد. ئەگەرچی پێوەندیی ئێمە تۆزێ گۆڕاوە، بەڵام لەگەڵ گەڕانەوەمان بۆ نیکۆلسکایا و دانیشتن لەگەڵ تاتیانا سمیۆنۆڤنا پێوەندیی ڕابردوومان دیسان دادەمەزرێتەوە و گەرموگوڕی لەخۆ دەگرێتەوە.

زستانم بەو شێوەیە تێپەڕاند، بەجۆرێک کە من تێپەڕینیم هەست پێ نەکرد و ئێمە بە پێچەوانەی بەرنامەکەمان، حەوتووی پیرۆز هەروا لە پترزبۆرگ ماینەوە. ڕۆژی سێ ـ تۆماس ئیتر ئامادەی وەڕێکەوتن بووین، بار و کەلوپەلمان پێچابۆوە و مێردەکەم ئەو دیاری و شتانەی کە پێویست بوو، تەنانەت گوڵیشی کڕیبوو، زۆر سەروڕووخۆش و لەگەڵ مندا مێهرەبان بوو کە کچەکەی پووری لە ناکاو هات بۆ سەردانمان و ئیسەرەمی دەکرد کە ئێمە هەتا ڕۆژی یەکشەممە لەوێ بمێنینەوە و بچین بۆ میوانداریی "کۆنتس ڕ." دەیگوت کە "کۆنتس ڕ." زۆری پێداگری کردووە کە من بچم بۆ میوانداریییەکەی، چونکە "پڕەنس م." کە لەو کاتەدا لە پترزبۆرگ بوو لە کۆڕی سەمای پێشوودا منی

دیتووه و حەز دەكات لەگەڵ من ئاشنا بێ و تەنیا لەبەر من دێ بۆ ئەو میوانییە و دەڵێ كە من جوانترین ژنی ڕووسیام. دەیگوت هەموو ناودارانی پترزبۆرگ لەو كۆڕەدا كۆدەبنەوە و بۆ ئەوە نابێ من لەو كۆڕەدا نەبم.

مێردەكەم لەو سەری هۆڵەكە لەگەڵ كەسێك قسەی دەكرد.

كچەكەی پووری گوتی: «دەی ماری چ دەكەی، دێیی؟»

من چاوێكم لە مێردەكەم كرد و بە لەبزێكی تا ڕادەیەك لێبڕاوانە وەڵامم دایەوە: «ئێمە بڕیار وایە دووسبەی بگەڕێینەوە.» ڕوانینی من و مێردەكەم تێك بەزین. بەڵام ئەو خێرا ڕووی لێ وەرگێڕام.

پوورزاكەی گوتی: «ڕازی كردنی ئەو لەسەر من. ڕۆژی شەممە پێكەوە هەڵڵا ساز دەكەین و ئاور دەكەینەوە و هەمووان شێت و شەیدا دەكەین.»

من بە لەبزێكی نیوە بەزیو گوتم: «ئاخەر ئەو كارە هەموو بەرنامەكانی ئێمە هەڵدەوەشێنێتەوە. ئێمە بارگەوبنەمان پێچاوەتەوە.»

مێردەكەم لەو سەری هۆڵەكە، بە ڕقێكی شاراوە لە وتەكانیدا كە قەتم ئاوا نەدیبوو گوتی: «جا بۆ هەر ئەمشەو نەچێ بۆ دەست ماچ كردنی پڕەنس؟»

پوورزاكەی پێكەنی و گوتی: «ئەیەڕۆ، خۆ بەغیرەتیش بووە، ئەوە یەكەم جارە كە ئاوای دەبینم.» ڕووی دەمی لە مێردەكەم گوتیشی: «بەڵام سێرگی میخائیلیچ خۆ مەبەست پڕەنس نییە. ئێمە هەموومان حەز دەكەین كە لەو كۆڕەدا بێ و لەلایەن هەمووانەوە دەمەوێ ڕازیی بكەم. بەخوا نازانی "كۆنتس ڕ." چەندەی لەسەر ئەوە پێداگری دەكرد!»

مێردەكەم بە ساردوسڕی گوتی: «هەر چۆنێك بۆخۆی حەزی لێیە!» ئەوەی گوت و لە هۆڵەكە چووە دەرێ.

دەمدی كە زیاتر لە كاتی ئاسایی پەشۆكاوە و ئەوەش زۆر بە لامەوە پڕ ئازار بوو بۆیە بەڵێنم بە پوورزاكەی نەدا. كاتێك ئەو ڕۆیشت من خێرا چووم بۆ لای مێردەكەم. دیتم بە گۆمی فیكر و خەیاڵدا ڕۆچووە، لە نێو ژوورەكەدا دەهات و دەچوو و منی نەدی كە بە پێدزە چووم بۆ ژوورەكەی و تەنانەت ترپەی پێشمی نەبیست.

که لێی نزیک بوومەوە لە دڵی خۆمدا گوتم: «حەتمەن بیر لە ماڵە شیرینەکەمان لە نیکۆلسکایا دەکاتەوە و هەروەها بیر لە ژووری ڕووناکی میوانداری و ژێر ساباتی دڵگر و باخ و مەزرا و کشتوکاڵەکەمان و مووژیکەکان و ئەو شەوانەی کە لە هۆڵەکە ڕاماندەبوارد و خواردنی پەنامەکیی شەوانە لە ژووری کارەکەی دەکاتەوە.» بڕیاری خۆم دا و بە خۆم گوت: «نا. هەموو کۆڕی سەما و میوانی دنیا و ڕێزی پرەنسەکان بە قوربانی تاقە ساتێکی ئەشق و لاواندنەوەی ئەو بێ!» دەمویست بڵێم ناچم بۆ میوانیی "کۆنتس ڕ." و نامەوێ بچم؛ کە سەری وەرسووڕاند و منی دی نێوچاوانی تێک نا و حاڵەتی ڕوخساری بە مێهرەبانی و نیگەرانی گۆڕدرا و دیسان وردبینی و بیرمەندی و هێمنایەتی لە نیگایدا وەدیار کەوت. ئەو حەزی نەدەکرد لەبەر چاوی من مرۆڤێکی ئاسایی بێ. دەیویست هەمیشە لەلای من نیوە خودایەک بێ و وەک پیاوێکی مەزن و پۆلاکورۆژ بنوێنێ کە لە سەر سەکۆی مەزنی و شکۆ ڕاوەستاوە!

بە سەرسادی و پشوودرێژییەوە گوتی: «دەی، خۆشەویستەکەم؟» من وەڵامم نەدایەوە. ڕقم لەوە هەستا بوو کە ڕوخساری ڕاستەقینەی خۆی لە من دەشارێتەوە و نایەوێ ئەو کەسە بێ کە من خۆشم دەوێ.

پرسیی: «حەز دەکەی ڕۆژی شەممە بچی بۆ ئەو میوانداریيە؟»

گوتم: «بەڵێ، حەزم دەکرد، بەڵام تۆ پێت خۆش نییە.» پاشان گوتیشم: «ئەوەش بە جێی خۆی بارگەوبنەمان پێچاوەتەوە.»

قەت ئاوا بە بێزاری چاوی لێ نەکردبووم و ئاوا ساردوسڕیش لەگەڵم نەدوا بوو.

گوتی: «من هەتا ڕۆژی سێ شەممە لێرە ناڕۆم و دەڵێم جانتا و بارەکان بکەنەوە. بۆیە ئەگەر پێت خۆش بێ دەتوانی بچی بۆ میوانی. تکایە بچۆ. بەڵام من نایەم.»

وەک هەموو جارێک کە دەپەشۆکا و بە ڕەفتارێکی تۆسنانەوە لە نێو ژوورەکەدا دەهات و دەچوو، چاوی لە من نەدەکرد.

من لە جێی خۆم چەقیبووم و چاوم لە جووڵە و ئاکاری دەکرد، گوتم: «من بەڕاستی سەرم لە کاری تۆ دەرناچێ. تۆ هەمیشە دەڵێی کە زۆر لەسەرەخۆی

(هەڵبەت ئەو قەتی ئەو قسەیە نەکردبوو) تێناگەم بۆچی بەو لەبزە سەیرە لەگەڵ من قسە دەکەی؟ من ئامادەم لەبەر دڵی تۆ فیداکاری بکەم و لە چێژی چوون بۆ ئەو میوانییە چاوپۆشی بکەم، تۆش ئاوا بە تەڤز و تەشەرەوە داوام لێدەکەی بچم؟ من قەت ئاوام لە تۆ ڕانەدەدی!»

ـ«باشە، تۆ بۆ من "فیداکاری" دەکەی. (ئەو وشەیەی لە بەینی ددانییەوە دەربڕی.) منیش بۆ تۆ فیداکاری دەکەم. لەوە باشتر چیت دەوێ؟ کێبڕکێیەکی گەورەیی و لەخۆ بردوویی. بەختەوەریی بنەماڵە لەوە باشتر چییە؟»

یەکەم جار بوو کە قسەی ڕەق و پڕ توانجم ئاوا بە ڕاشکاوی لێ دەبیست. تەشەرەکەی شەرمەزاری نەکردم بەڵام ڕەنجاندمی. قسە چزوودارەکانی ترسی نەخستە دڵمەوە بەڵکوو ژارەکەی کاری لێکردم. ئەو کە لە پێوەندیماندا ترسی لە کاردانەوەی وشەکان هەبوو و پارێزی لە تەوس و تێز و قسەی بە توێکڵ دەکرد، ئەو کە سادەیی و دڵپاکییەکەی لە ڕادەبەدەر بوو، ئێستا ئاوا لەگەڵ من دەدوا؟ ئاخەر بۆچی؟ پاداشی منێک کە دەمویست فیداکاری بکەم و لە چێژ و خۆشیی میوانی چاوپۆشی بکەم کە هیچ شتێکی خراپم لێ نەدەدی و ساتێک لەمەوبەر دڵخۆش بووم کە لە ڕاز و نهێنیی دەروونی ئاوا بە باشی تێدەگەم و بە گیان و بە دڵ خۆشم دەوێ، ئەمە بوو؟ ڕۆڵەکانمان پێکەوە ئاڵوگۆڕ کردبوو: ئەو لە ساکاری و ڕاشکاوی بێزار بوو و من خوازیار و تامەزرۆی بووم.

هەناسەیەکم هەڵکێشا و گوتم: «تۆ چەند گۆڕاوی! ئاخەر خەتای من چییە؟ دەزانم تەنیا قسە لەسەر ئەو میوانییە نییە. تۆ شتێکی تر لە دڵت دایە کە ماوەیەکە دژ بە من هەڵتدەخڕێنێ و ئازارت دەدا. ئەو شاردنەوەیەی بۆ چییە؟ خۆت نەبووی لە شاردنەوە و حاشاکردن دەترسای؟ بە ڕاشکاوی پێم بڵێ چیت بە منەوە دیوە؟» لە دڵی خۆمدا دەمگوت: «ئێستا دەتوانی چی بڵێی؟» بە ڕەزایەتی تەواوەوە چەند مانگی ڕابردووم لە زەینمدا مروور کردەوە و دیتم لە سەرەتای زستانەوە تا ئەو کاتە ناتوانێ هیچ گلەیی و سکاڵایەکی لە دەستم هەبێ.

هەتا نێوەڕاستی هۆدەکە چوومە پێشێ، بە جۆرێک کە شوێنی گەڕانەوەی بوو و چاوم تێبڕی و بە خۆم گوت حەتمەن لێم نزیک دەبێتەوە و لە باوەشم دەگرێ و کێشەکە دەبڕێتەوە و تەنانەت زۆریش بە داخەوە بووم کە کارەکە بەوجێیە ناگات

پێی بسەلمێنم کە هەقم بە دەست بووە، بەڵام ئەو بۆ لای من نەگەڕایەوە و لەو سەری ژوورەکە ڕاوەستا و چاوی لێکردم.

گوتی: «تۆ هێشتا تێنەگەیشتووی؟

ـ«نا!»

ـ«باشە، کەوایە ناچارم خۆم پێت بڵێم. مەسەلەکە ئەوەیە کە من بێزم لەو شوێنانە هەڵدەستێ. یەکەم جارە کە ئەو هەستەی لە دڵمدا هەڵدەقووڵێ و ناتوانێ هەڵنەقوڵێ، قێزم هەڵدەستێنێ.» بێدەنگ بوو و دیار بوو ئەو ڕق و تووڕەییەی لە دەنگیدا بوو ترساندوویەتی.

فرمێسکی بێزاری لە چاوانمدا قەتیس ما و پرسیم: «ئاخەر چبووە؟»

ـ«بێزم هەڵدەستێ و بێزارم لەوەی کە پڕەنس تۆی بە دڵە و لەبەر چاوی ئەو جوان و دڵڕفێنی و تۆش بۆ سیلەی چاوێکی پڕەنس ئاوا خێرا و بە تاڵووکە گڕ دەگری و دەکەوییە هەلەکەسەما، مێردەکەت و خۆت و حەیا و فهێتی ژنانەت لەبیر دەبەیتەوە و ناتەوێ لەو هەستە تێ بگەی کە مێردەکەت دەبێ بەجێی تۆ هەستی پێ بکات،تۆ ڕێزەیەک ڕێز و حەیای خۆت مەبەست نییە و دەیخەیە ژێرپێ. زۆر ڕووهەڵماڵدراوانەش لە هەمبەرمدا ڕادەوەستی و "منەتبارم دەکەی" کەلەبەر خاتری من "فیداکاری" دەکەی. یانی پێم دەڵێی "چوونە خزمەت حەزرەتی پڕەنس و خۆ لە گوڵ دان بۆی، سەربەرزی و بەختەوەرییەکی هێندە گەورەیە بۆ من  کە پێت وایە "فیداکاری"  و لەخۆبردووییە و لەبەر دڵی من چاوپۆشی لەو چێژ و خۆشییە دەکەی؟"»

هەرچی زیاتر قسەی دەکرد بە بیستنی دەنگی خۆی زیاتر تووڕەیی و تاڵی و توندیی بۆ دەردەکەوت و گەرم دادەهات. قەتم ئاوا نەدیبوو و چاوەڕوانیش نەبوو ببیبنم. دڵم بە پرتاو لێی دەدا و دەترسام. لەگەڵ ئەوەشدا ڕەنجان و شەرمەزارییەک کە بە ناهەق بەرۆکی گرتبووم بەجارێ شڵەژاندبوومی و دەمویست تۆڵەی خۆم بکەمەوە.

گوتم: «لەمێژ بوو چاوەڕوانی ئەوە بووم. بیڵێ دەی بیڵێ، ئەوی پێت خۆشە بیڵێ!»

ئەو گوتی: «نازانم تۆ چاوەڕوانی چی بووی. بەڵام من کە تۆم دەدی خەریکی لە زەلکاوی بۆگەن و باقوبریقی ئەو پەست و خوێڕییانە ڕۆدەچی دەمزانی دەبێ چاوەڕوانی کارەساتێکی گەورە بم و ئێستاش ئەوا ئەو کارەساتە دەرکی پێگرتووم. کاریشم گەیشتۆتە جێیەک کە دەبێ شەرمەزارییەک تامڵ بکەم و ئازارێک بکێشم کە لە ماوەی ژیانمدا لەگەڵی بەرەوڕوو نەبووم، ئەوەی لە هەمووشی زیاتر دەمتەزێنێ و دەردم بە گەروودا دەکا ئەوەیە کە ئەم خاتوونە ماقووڵە بەو دەستە پیس و ڕموودەیەی دڵم دەپشکنێ و دەیهەوێ لەوێدا گومان و حەسوودی بدۆزێتەوە. ئاخەر دڵپیسی کردن لە کێ؟ لە پیاوێک کە نەمن دەیناسم نەتۆ؟ تۆش بە لای ناخێرت دەتهەوێ فیداکاری بکەی، کەچی لە دەرد و ئازاری من تێناگەی و وادیارە ناتەوێ تێبگەی. جاپێم بڵێ دەتەوێ چی فیدا بکەی؟ بە ڕاستی وەختە داڕزێم و شەرمەزارم کە ئەو سووکی و پەستییەی تۆ دەبینم!»
دیسان دووپاتی کردەوە: «...فیداکاری!»
لە دڵی خۆمدا گوتم: «پەککوو، هاوار لە دەست ئەو دەسەڵات و زافتەیەی پیاوان! مێردە و هەق بە خۆی دەدا کە سووکایەتی بە ژنە بێ تاوانەکەی بکات و بە سووک و چرووکی بزانێ. ئەوە مافێکە کە پیاوان بۆخۆیانیان دەستەبەر کردووە و ئەو هەقە بە خۆیان دەدەن. بەڵام من قەت ناچمە ژێر باری ئەو هەقە.»
گوتم: «نا، من هیچ فیداکارییەکم نییە بۆ تۆی بکەم. ڕۆژی شەممەش دەچم بۆ ئەو میوانییە و دنیا و عالەم سەرلێک بدات هەر دەچم.» هەر لەو کاتەدا هەستم کرد کە چۆن پەڕەی لووتی خەریکە لێک دەڕەوێتەوە و ڕەنگی سپی هەڵدەگەڕێ.
ئەو ڕقێکی کتوپڕ و بەدەر لە ئیختیاری خۆی سەرتاپای داگرتبوو نەڕاندی: «هیوادارم زۆر کەیف بکەی. بەڵام هەموو شتێک لە نێوان ئێمەدا کۆتایی پێ هات. شوکری خودا دەکەم کە ئیتر لە دەست تۆ ئازار ناکێشم. تاوانی خۆمە کە خۆم گەوج کرد و ...»
لێوی کەوتبووە لەرزین بەڵام بە هەوڵێکی ئاشکرا ددانی بە خۆیدا گرت کە ئەو ڕستەیەی دەستی پێکردبوو تەواوی نەکات.
من لەو کاتەدا لێی دەترسام و لێشی بێزار بووم. دەمویست زۆر شتی پێ بڵێم و تۆڵەی هەموو ئەو سووکایەتییانەی لێ بکەمەوە. بەڵام دەمزانی دەمم لێک

بکەمەوە دەگریم و گەورەیی و ئابڕووی خۆم دەدۆڕێنم و بە بۆڕخواردووم دەزانێ. هیچم نەگوت و لە ژوورەکە چوومە دەرێ. بەڵام کە دوور کەتمەوە و ئیتر ترپەی پێیم نەهاتە گوێ ترسێک سەرتاپای داگرتم. ترسی پسانی پێوەندیی هەمیشەیی کە بناغەی بینای بەختەوەریی من بوو خورپەیەکی خستە دڵمەوە کە دەمویست بگەڕێمەوە. بەڵام لە دڵی خۆمدا گوتم: «ئێستا بڵێی ئەوەندە هێور بووبێتەوە کە کاتێک من بە بێ درکاندنی وشەیەکی نارەزایەتی باوەشی ئاشتیی بۆ بگرمەوە، ئەو لە ماناکەی تێ بگات؟ بڵێی گەورەیی منی بۆ دەرکەوێ؟ یان ڕەنگە لەسەر هەقانەتی خۆی سوور بێ و بە ئاسوودەیییەکی پڕ فیز و لووت بەرزانەوە دەستم بە ڕووەوەنەنێ و بە خەیاڵی خۆی لە تاوانم ببورێ. بەڵام ئاخەر بۆ؟ بۆچی منێک کە هەتا ئەو ڕادەیە خۆشم دەویست ئاوا دڵڕەقانە وردی کردم؟»

نەچووم بۆ لای، گەڕامەوە بۆ ژوورەکەی خۆم، دانیشتم و ماوەیەکی زۆر گریام. دەمەقاڵێ و کێشەکەمانم وشە بە وشە مروور کردەوە و وشەی دیکە، وشەی شیرین و پڕ خۆشەویستیم لە جێ دانان و دیسان وشەی لەو شێوەیەم پێ زیاد کردن و دیسان بە ترس و پەستییەوە ئەوەی ڕووی دابوو وەبیر خۆمم هێنایەوە. ئێوارە بەسەردا هات و بۆ خواردنەوەی چایی لە هەنتەشی "س."دا کە میوانمان بوو، لەگەڵ مێردەکەم بەرەو ڕوو بووم و هەستم کرد ئەمڕۆ کەندڕێکی قووڵ لە نێوانماندا بەدی هاتووە و زاری کردۆتەوە. "س." لێی پرسیم کەنگێ وەڕێ دەکەوین، مێردەکەم وەڵامەکەی لە دەمم ڕفاند و گوتی: «سێ شەممە! چونکە دەمانەوێ بچین بۆ میوانیی "کۆنتس ڕ."» ڕووی لە منیش کرد و درێژەی پێدا: «تۆ دێی؟ ها!»

من بە بیستنی دەنگە گڕەکەی دیسان ترسم لێ نیشت و شەرمنانە چاوم لە چاوی کرد. ڕاست چاوی لە چاوم بڕیبوو بەڵام ڕوانینەکەی مانادار و گاڵتە ئامێز بوو و لەبز و دەنگی بەری لە هەست و سۆز بوو.

وەڵامم دایەوە: «بەڵێ!»

شەوێ کە تەنیا کەوتین هات بۆ لام و دەستی ئاشتیی هێنایە پێشێ و گوتی: «تکات لێدەکەم ئەو قسانەی ئەمڕۆ کردم بە دڵیانەوە مەگرە و لەبیر خۆتی بەرەوە!»

من دەستیم گوشی و بزەیەکی لەرزۆک نیشتە سەر لێوم، فرمێسک لە چاومدا قەتیس ما و خەریک بوو بە ڕوومەتمدا بێتە خوارێ. بەڵام ئەو دەستی بەردام و چوو لەسەر کورسییەکی دوور لەمن دانیشت، دەتگوت لە دەربڕینی هەست و سۆزی گەرم و ئاشقانە دەترسێ. من لە دڵی خۆمدا گوتم: «یانی هێشتاش پێی وایە هەقی بە دەستە؟» خەریک بوو وەقسە بێم و مەسەلەکە باس بکەم و ئەوی هەیە و نییە لەگەڵی بێنمە گۆڕێ و داوای لێ بکەم نەچین بۆ ئەو میوانییە بەڵام بێدەنگ مام.

گوتی: «دەبێ بۆ دایە گیانم بنووسین کە سەفەرەکەمان پەکی کەوتۆتەوە، دەنا دڵ نیگەران دەبێ.»

پرسیم: «پێت وایە کەنگێ دەگەڕێینەوە؟»

وەڵامی دایەوە: «سێ شەممە دوای میوانییەکە!»

چاوم لە چاوی بڕی و گوتم: «هیوادارم ئەو بڕیارەت لەبەر خاتری من نەبێ!»

چاوانی تەنیا دەیانڕوانی و قسەیان نەدەکرد. دەتگوت پەردەیەک لە نێوانماندا دادراوەتەوە و دڵمانی لە یەکتر جیا کردۆتەوە. ڕوخساری لەناکاو پیر هاتە بەر چاوم و دڵی ناخۆش کردم.

چووین بۆ میوانییەکە و لە ڕواڵەتدا دەتگوت پێوەندیی باش و دۆستانە لە نێوانماندا دامەزراوەتەوە. بەڵام ئەم پێوەندییە لەگەڵ ئەوەی ڕابردوو زۆر جیاواز بوو.

لە میوانییەکە من لە نێو ژنەکاندا دانیشتبووم کە پڕەنس هات بۆلام، بەجۆرێک کە ناچار بووم لە بەری هەستم تاکوو قسەی لەگەڵ بکەم. هاوکات لەگەڵ هەستان بێ ئیختیار چاوم بە دوای مێردەکەمدا دەگێڕا و دیتم ئەو لەوسەری تەلارەکە چاوەدێریم دەکات، کە منی دی و زانیی چاو بە دوای ئەودا دەگێڕم ڕووی وەرگێڕا و من لەناکاو وەها تووشی شەرمەزاری بووم و ئەو حاڵەتە هێندە بە ژان بوو کە سەرم لە گێژەوە هات و لەلای پڕەنس ڕوخسارم سوور هەڵگەڕا، بەڵام ناچار بووم لەسەر پێ ڕاوەستم و گوێ بۆ قسەکانی ڕاگرم کە چاوی تێ بڕیبووم، بەڵام ئاخافتنەکەمان زۆری نەخایاند چونکە لە تەنیشت من جێگای خاڵی نەبوو دانیشێ و پێموا بۆشی دەرکەوت کە شەرم دەکەم و بۆ قسەکردن لەگەڵی ئاسوودە

نیم. باسەکەمان لەسەر کۆڕی سەمای ڕابردوو بوو و لەو جۆرە قسانە. کاتێک ویستی لێم دوورکەوێتەوە گوتی کە حەز دەکات لەگەڵ مێردەکەم ئاشنا بێ و پاشان دیتم لەو سەری تەلارەکە خەریکن پێکەوە قسە دەکەن. پێموابێ پڕەنس سەبارەت بە من قسەی لەگەڵ دەکرد چونکە مێردەکەم لە کاتی قسەکردندا زەردەی دەگرت و چاوی لە من دەکرد.

بەڵام لە ناکاو دیتم گرژ بوو و کڕنۆشێکی کرد و بەبێ خوداحافیزی لە پڕەنس دوور کەوتەوە. منیش ڕەنگم تێک چوو و بە هۆی ئەو شتانەوە کە پڕەنس سەبارەت بە من بیستبووی و بۆچوونێک کە سەبارەت بە من و بە تایبەت مێردەکەم لەلای دروست بووبوو. پێم وابوو هەمووان شەرم و نیگەرانیی منیان لە کاتی ئاخافتن لەگەڵ پڕەنس دیوە و هەروەها ڕەفتاری سەیری مێردەکەم لەگەڵ ئەو لە هیچ کەس شاراوە نەبوو. خودا دەزانێ ئەوەی دیتبوویان چۆنیان لێک دابۆوە. یانی بڵێی لە دەمەقاڵێی من و مێردەکەشم ئاگادار بووبن؟ پوورزای شووەکەم منی گەیاندەوە ماڵێ و لە ڕێگا سەبارەت بە ئەو قسەمان کرد. من خۆم پێ ڕانەگیرا و ئەوەی لەسەر ئەو میوانییە ناچارییە لە نێوانماندا ڕووی دابوو هەموویم بۆ باس کرد. ئەو هەوڵی دا دڵخۆشیم بداتەوە و گوتی کە کێشەیەکی زۆر ئاساییە و گرینگ نییە و تێدەپەڕێ و لەبیر دەچێتەوە، سەبارەت بە خووخدەی مێردەکەم لە ڕوانگەی خۆیەوە بڕێک دوا و گوتی کە ئەو زۆر بە دوور لە داب و نەریتی کۆمەڵگایە و بادیهەوا و لووت بەرزە. من لەگەڵ بیر و بڕوای ئەو هاوڕا بووم و هەستم کرد تۆزێک دڵم هێور بۆتەوە و لەخدە و خەسڵەتی مێردەکەم زیاتر تێگەیشتووم.

بەڵام کاتێک لەگەڵ مێردەکەم تەنیا کەوتین ئەم داوەرییە وەک بارێک لەسەر ویژدانم قورسایی دەکرد و هەستم کرد ئەو کەندڕەی کەوتبووە نێوانمان و لێکی جیا کردبووینەوە قووڵتر و بەرینتر بۆتەوە.

هەشت

لەو ڕۆژە بەدواوە ژیان و پێوەندیمان پێکەوە بە تەواوی گۆڕا. ئیتر وەک ڕابردوو چێژمان لە پێکەوە بوون وەرنەدەگرت. هێندێک مەسەلە هەبوو کە خۆمان لە باس کردنیان دەبوارد. لە هەنتەشی خەڵکیدا ئاسوودەتر پێکەوە قسەمان دەکرد هەتا ئەو کاتانەی پێکەوە دەبووین. هەر کاتێک باسی ژیانی گوند یان کۆڕی سەما و میوانداری دەهاتە گۆڕێ دەتگوت بەر چاومان تاریک دەبێ و زۆر بە زەحمەت دەمانتوانی چاو لە چاوی یەکتر بکەین و زۆر ناڕەحەت دەبووین. دەتگوت هەردووکمان هەر یەکەی لە بەرێکی ئەو هەڵدێرەی نێوانمان ڕاوەستاوین و بە هەست تێدەگەیشتین و دەترساین لێی نزیک ببینەوە. من دەمزانی کە ئەو پیاوێکی لەخۆبایی و ئاڵەتییە و دەبوو زۆر وریا بم و شوێن لەسەر خاڵی هەستیاری دانەنێم. ئەو دڵنیا بوو کە من ناتوانم لە کۆڕ و دانیشتنی خانەدان و گەوران واز بێنم و ژیانی لادێ لەگەڵ زەوقم ناسازگارە و ئەو ناچارە لەگەڵ ئەو سەلیقە ناسازگارەی من بسازێ و ئێمە هەردووکمان خۆمان لە باس کردنی ڕاشکاوانەی ئەو جۆرە شتانە دەبوارد و بە هەڵە داوەریمان لەسەر یەکتر دەکرد. ماوەیەکی زۆر بوو ئیتر هاودڵی لە نێوانماندا بارگەی پێچابۆوە و بە چاوی بێگانە و نامۆ لە یەکترمان دەڕوانی و یەکترمان لەگەڵ خەڵکی هەڵدەسەنگاند و هەر کام لەلای خۆمانەوە سەبارەت بە ئەوی تر کلاومان دەکردە قازی. من بەر لە سەفەر نەخۆش کەوتم و بەجێی ئەوەی بگەڕێینەوە بۆ گوند چووین بۆ زۆزان و مێردەکەم لەوێوە بە تەنیا چوو بۆ لای دایکی. کاتێک ئەو ڕۆیشت من تەندروستیم بە دەست هێنابۆوە و دەمتوانی لەگەڵی بچم بەلام ئەو پێملی کردم لەوێ بمێنمەوە. دەتگوت نیگەرانی تەندروستیی منە. بەلام من هەستم کرد دڵ نیگەرانییەکەی لەبەر تەندروستیی من نییە بەڵکوو دەترسێ پێکەوەبوونمان لە گوند ناخۆش و پڕ ئازار بێ. منیش زۆرم پێداگری نەکرد و لە زۆزان مامەوە. دوور لە ئەو ژیان بۆ من سارد و خاڵی بوو و تەنیایی پڕ بوو لە دڵتەنگی و پەژارە، بەلام کاتێک ئەو گەڕایەوە دیتم ئەوەی کە بوونی لە ڕابردوودا بە ژیانی دەبەخشیم ئیتر پێم نابەخشێ. لە ڕابردوودا پێوەەندیمان جۆرێک بوو کە بیروڕا و کارتێکرانم لە ژیان، هەتا مووبەموو لەگەڵم نەهێنایەتە گۆڕێ دڵم نەدەحەسایەوە و وەک تاوانێک لەسەر دڵم قورسایی دەکرد و هەر کارێک کە ئەو

دەیکرد و هەر قسەیەک لە زاری ئەو دەهاتە دەرێ نموونەی کەماڵ بوو بۆم و دیداری سادە و ئاساییمان نەشە و شادیی پێ دەبەخشیین و گوڵی پێکەنینی لەسەر لێومان دەڕسکاند. بەڵام ئەو هاودڵییە وردەوردە جۆرێک جێی خۆی دا بە پێوەندییەکی تر کە خۆشمان هەستمان بە گۆڕانی نەکرد. هەرکام لە ئێمە مەیل و دڵەخورپەی تایبەت بە خۆمان هەبوو کە نەماندەویست پریسکەی دڵمان لەلای یەکتر بکەینەوە. تەنانەت دەربەستی ئەوەش نەبووین کە هەرکام دنیای تایبەت بە خۆمان هەبێ و ئەوی تر ڕێگای نەبێ بێتە ناوی و لەگەڵی بێگانە بێ. خوومان بەو جۆرە هەست و بیرانە گرتبوو، بە جۆرێک کە هەر کاتێک چاومان لە یەکتر دەکرد بەر چاومان تاریک نەدەبوو. گڕوتینی شادی و هەڵسوکەوتی منداڵانەی لەگەڵ من بە تەواوی دامرکا بوو. خووی پڕ لە چاوپۆشی و هاوسەنگی و هێمنایەتیی ڕۆحیی کە لە ڕابردوودا دەبووە هۆی سەرپێچی و ڕق هەستانی من، ئیتر بە تەواوی لەنێو چووبوو. ئەو ڕوانین و نیگا گەرمانەی کە پێشتر ئارام و ئۆقرەی لێ هەڵدەگرتم و لەگەڵ ئەوەشدا شادی و چێژی پێدەبەخشیم ئیتر ئاسەواری نەمابوو. ئیتر پێکەوە دۆعامان نەدەخوێند و ئەو ساتە پڕ لە حەز و شەیداییيانە ئیتر دووپات نەدەبوونەوە. تەنانەت زۆرمان چاو بە یەکتر نەدەکەوت. ئەو بەردەوام لەسەفەر دابوو و ئیتر وەک ڕابردوو بەجێ هێشتنی من ترسی نەدەخستە دڵیەوە و تەنانەت گوێشی پێی نەدەبزوا. من کاتی خۆم بەردەوام لە کۆڕ و میوانییەکان ڕادەبوارد چونکە لەو جۆرە کۆڕانەدا هیچ پێویستییەکم بە ئەو نەبوو.

ئیتر کێشە لە نێوانماندا هەڵنەدەگیرسا. من هەوڵم دەدا ڕازایەتی ئەو بە دەست بهێنم، ئەویش هەرچی من بمویستبایە جێ بە جێی دەکرد و پێمان وابوو یەکتریمان خۆش دەوێ.

کاتێک پێکەوە دەبووین، کە زۆرکەم وا هەڵدەکەوت، من هەستی شادیم لە دڵدا نەبوو. نەهەڵدەچووم و نە خەمباریش دەبوم. وەک ئەوە وابوو هیچ کەسم لەلا نەبێ. بە باشی ئاگادار بووم کە ئەو کەسەی لەلامە مێردمە نەک پیاوێکی نەناسیاو،هەروەها دەمزانی پیاوێکی زۆر باشیشە. دەمزانی میردمە و لە خووخدەی ئاگادارم و وەکوو خۆم دەیناسم. دڵنیا بووم کە دەزانم لە هەر

بابەتێکەوە چی دەکات و چیی دەوێ و لە چ حاڵێکدا دەبێت و ئەگەر کارێکی دەکرد یان شتێکی دەگوت کە من چاوەڕوانیم لێی نەبوو پێموا بوو بە هەڵە چووە. هیچ چاوەڕوانییەکم لێی نەبوو. وەلحاسڵ ئەو تەنیا مێردم بوو و هیچی تر. پێموابوو لەوە زیاتر هیچ شتێکی تر نابێ هەبێت و هیچ پێوەندییەکی تر لە نێوانماندا نییە و قەتیش نەبووە. کاتێک، بەتایبەت لە سەرەتای نێوان تێکچوونەکەماندا، کە دەچوو بۆ سەفەر من هەستم بە تەنیایی دەکرد و دەترسام و بۆم دەردەکەوت کە پشتیوانیی ئەو بۆ من چ نێعمەتێکی گەورەیە و کاتێک دەگەڕاوە لە خۆشیانا باوەشم پێدا دەکرد و بەخۆمەوە دەگوشی، بەڵام دوو سەعات دواتر هەموو شتێکم لەبیر دەچۆوە و هیچ قسەیەکم نەبوو لەگەڵ ئەودا بیکەم. تەنیا لە کاتی ئارامی و خۆشەویستیدا لەگەڵ هاوسەنگییەک کە هێندێ جار لە نێوانماندا پێک دەهات هەستم دەکرد ناسازگارییەک لە پێوەندییەکەماندا هەیە و شتێک دڵم ڕێک دەگوشێ و وەژانی دەخات، وەک ئەوەش وابوو کە چاوانی ئەویش ئەو حاڵەتە بنوێنن. ئەو سنووری خۆشەویستییەی کە پێموا بوو ئەو نایەوێ پێیدا تێپەڕێ و من ئیتر نەمدەتوانم لەوە زیاتر بڕۆمە پێشێ، بە ئاشکرا هەستم پێدەکرد. ئەو بارودۆخە هێندێ جار خەمباری دەکردم بەڵام دەرفەتم نەبوو لەسەر هیچ شتێک هەڵوەستە بکەم و هەوڵم دەدا داخی دڵم بە گۆڕانێکی خەیاڵی و هەست پێکراو کەم کەمەوە، یان بەهۆی ئەو سەرگەرمییانەوە کە هەمیشە ئامادە بوون بۆم خەمەکانی دڵم بەربا بدەم و لەبیریان بەرمەوە. حەز و تامەزرۆیییەک کە لە کۆڕ و میوانی گەوراندا سەرەتا بە بریق و باقی خۆی سەرنجی ڕادەکێشام و لە ڕێگای خۆپەرەستی و شایی بە خۆبوونەوە شەیدای دەکردم، زۆر زوو بەسەر هەموو تاسەکانی دیکەمدا زاڵ بوو. خووم پێگرت و بە تەواوی کەوتمە داوی و لە سینگمدا شوێنێک بۆ هیچ هەستێکی تر نەمایەوە. ئیتر قەت بە تەنیا نەدەبووم و لە خەڵوەت و تەنیاییدا بیر و خەیاڵ تەنگی پێ هەڵنەدەچنیم، خۆم لە بیر و خەیاڵ سەبارەت بە حاڵوباڵی خۆم دەبوارد و لە بەیانییەوە کە درەنگ لە خەو هەڵدەستام، هەتا درەنگانێکی شەو تەنانەت ئەو کاتانەی لە ماڵێش نەدەچوومە دەرێ، کاتی زیادیم بۆ فیکر و خەیاڵ نەبوو. ئەم بارودۆخەش زۆر چێژبەخش

بوو بۆم نەک جاڕزکەر. پێموابوو ژیان دەبێ هەمیشە ئاوابێ و جگە لەوە شتێکی تر نییە.

سێ ساڵ بەو جۆرە تێپەڕی و پێوەندیی ئێمە هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نەهات. دەتگوت ژیان بەو شێوەیە لە قاڵب دراوە و وەهای چەق بەستووە نەباشتر دەبێ و نە خراپتر. لەو سێ ساڵەی ژیانی ژنومێردایەتیماندا دوو ڕووداوی گرینگ ڕووی دا، بەڵام هیچ کامیان شوێنی لەسەر ژیان و پێوەندیمان دانەنا. ئەم دوو ڕووداوە یەکیان لە دایک بوونی کوڕەکەم بوو و ئەوی تر مەرگی دایکی ئەو. سەرەتا خۆشەویستیی دایکانە وەها دڵی داگرتم و سۆز و ئەشقێکی لە دڵمدا هەڵگیرساندبوو کە پێموا بوو دەرووی ژیانێکی نوێ بە ڕوومدا کراوەتەوە. بەڵام دوای تێپەڕینی دوو مانگ کاتێک من دیسان لە ماڵێ چوومە دەرێ، ئەم هەستە وردەوردە لە کزیی دا و کەوتمە سەرباری ئاسایی و لە ئەستۆ گرتنی ئەرکی قۆڕ و بێ تامی دایکانە. بە پێچەوانە مێردەکەم لەگەڵ لەدایکبوونی کوڕەکەمان سۆز و دڵۆڤانییەکی دەروونی باوەشی لە ڕۆحی وەرهێنایەوە و وەک ڕابردوو نەرم و ڕووخۆش و خانەکی بوو و بارانی خۆشەویستیی و شادیی ڕابردووی بەسەر منداڵەکەماندا دەباراند. زۆر جار، شەوانە کاتێک بەر لە چوونە دەرێ لە ماڵ، بە جلوبەرگی ڕازاوەی میوانییەوە دەچووم بۆ ژووری کوڕەکەم تاکوو مەمکی پێبدەم و بیخەوێنم، مێردەکەم لەوێ دەدی و ڕوانینی تیژ و پڕ لە تەشەر و توانجیم لەسەر خۆم هەست پێدەکرد و هەستی پەژیوانی دڵ و گیانی دادەگرتم. ئاخری ڕۆژێک وەخۆ هاتمەوە و زانیم دەرهەق بە کوڕەکەم چەندە دڵڕەقم و بە خۆمم گوت: «یانی من لە ژنانی تر خراپترم؟ چبکەم؟ خۆ کۆرپەکەمم خۆش دەوێ، بەڵام خۆ ناتوانم لە بەیانییەوە هەتا شەوێ لەلای بم و وەک پەپوولە بە دەوریدا بخولێمەوە. زۆر جاڕزکەرە بەڵام خۆ من نامەوێ درۆ لەگەڵ زاتی خۆم بکەم و حەز بە خۆڕانانیش ناکەم!» مەرگی تاتیانا سمیۆنۆڤنا بۆ مێردەکەم خەمێکی قورس بوو. دەیگوت لەو کاتەوە دایکی نەماوە ژیان لە نیکۆلسکایای تاڵ و پڕ ئازارە بۆی، بەڵام من بە پێچەوانەی ئەو ئەگەرچی بۆ مەرگی خەسووم بە داخەوە بووم و لەگەڵ مێردەکەم هاودەردیم دەکرد بەڵام ئێستا ئاسوودەتر بووم و لە گوند زیاتر هەستم بە هێمنایەتی دەکرد. لەم سێ ساڵەدا زیاتر لە شار ڕامان

بواردبوو. تەنیا جارێک بە وادەی دوو مانگ هاتینەوە بۆ گوند و ساڵی سێیەم سەفەرمان کرد بۆ دەرەوەی وڵات.

سێ مانگەی هاوینمان لەیەکێک لە ناوەندەکانی ئاوی گەرم ڕابوارد.

بیست ویەک ساڵم تەمەن بوو. بارودۆخی ماڵێمان باش نەبوو. زیاتر لەوەی کە پێی دەدام هیچ چاوەڕوانییەکم لە ژیانی ژنومێردایەتی نەبوو. هەستم دەکرد هەموو دۆست و خزمان خۆشیان دەوێم. لەش ساغ بووم. لە هەمووان پۆشتە و پەرداختر و ڕازاوەتر بووم خۆشم دەمزانی شۆخوشەنگم. هەواکەی خۆش بوو و جوانی و ڕازاوەیی دەوری گرتبووم و وەلحاسڵ دڵخۆش و بێ خەم بووم. هەڵبەت لە ڕابردوودا، لە نیکۆلسکایا، لەوەش دڵخۆشتر بووم و هەستم دەکرد بەختەوەرییەکەم لە خۆمەوە سەرچاوە دەگرێ، چونکە پێم وابوو شایانی ئەوەم و چاوەڕوانیی زیاتریشم هەبوو، ئەم حاڵە پێوەندیی بە سەردەمێکی ترەوە هەبوو، بەڵام ئەو ساڵە هاوینیش زۆر خۆش بوو. ڕازی بووم. نە ئاواتێکم هەبوو نە چاوەڕوانیی شتێکی تازە. دڵم حەساوە بوو. ژیانم پڕ لە شادی و کامڕەوایی دەهاتە بەر چاو و هیچ بارێک لەسەر ویژدانم قورسایی نەدەکرد. لەنێو ئەو لاوانەدا کە لەم هاوینەدا لە دەوروبەرم بوون تەنانەت یەکێکیان نەبوو کە ڕێزەیەک سەرنجم ڕابکێشێ، تەنانەت "پرەنس ک." کە سەفیرمان بوو و هەوڵی دەدا دڵم بە دەست بهێنێ. یەکێک گەنج بوو، یەکێک بە ساڵاچوو، یەکێک ئینگلیزی کاکۆڵ زێڕین بوو و یەکێکی تر فەڕەنسی بە ڕیشی سەر چەناگەوە کە هەرکام بە شێوەیەک خۆیان شیرین دەکرد. هەموویان لەبەر چاوم یەکسان بوون، بەڵام من حەزم دەکرد وەک پەپوولە بە دەورمدا هەڵسووڕێن. پێویستم بە بوونی هەموویان هەبوو. ئەو ڕوخسارە یەکسانانە، کە هیچ کام لە دڵمدا جێیان نەبوو، خەرمانەیەکی درەوشاوە بوون بە دەوری مانگی ژیانمەوە. تەنیا یەکێکیان"مارکی د." کە کوڕێکی ئیتالیایی بوو بە هۆی بوێریی زیاترەوە و تاریف و پیاهەڵدانەکانی زیاتر لەوانی دیکە سەرنجی بۆ لای خۆی ڕاکێشا بووم. ئەو کوڕە هیچ هەلێکی بۆ هاوڕێیەتی و سەما یان سوارکاری و چوون بۆ گازینۆ لەگەڵ من، لە دەست نەدەدا. چەند جارم ئەو لە پەنجەرەی هوتێلەکەوە دی و ڕوانینی شەیدایانەی و بزەکانی کە بریقەیەکی ڕووهەڵماڵدراوانەیان پێوە بوو

ناڕەحەتی کردم، بە جۆرێک کە سوور هەڵگەڕام و ڕووم بۆ لایەکی تر وەرسووڕاند. لاوێکی جوانچاک و بۆشناخ بوو، بە تایبەت بزەکانی و نێوچاوانە پانەکەی زۆر لە مێردەکەم دەچوو و سەرنجی ڕاکێشا بووم، بەڵام ڕاستییەکەی لە مێردەکەم جوانچاکتر و دڵڕفێنتر بوو. ئەو شێوە و وێکچوونە تووشی واق و وڕمانی کردبووم، ئەگەرچی توند و تیژی و ئاکاری حەیوانی و ڕوانینەکانی و لێو و چەناگەی خڕوپڕی لە هەمبەر نەرمی و خووخدەی جوان و لەسەرەخۆیی و ڕووخۆشیی مێردەکەمدا، زۆر دیار و بەرچاو بوو. پێموا بوو ئاگری ئەشقێکی سووتێنەر دڵی داگرتووە و خەریکە بۆم شێت دەبێ، بۆیە جاروبار بە شێوەیەکی دڵسۆزانە و لە ڕووی خۆپەرەستی و گەورەییەوە بیرم لێ دەکردەوە. هێندێ جار هەوڵم دەدا ئەو گڕی ئەشقە دامرکێنمەوە و ئاکاری بێنمەوە سەر باری شایان و هاوسەنگی و سنوورێکی نیوە دۆستانەی لەبەر دەم دانێم. بەڵام ئەو بە هیچ جۆرێک پێملی ئەو هەوڵانەی من نەدەبوو و بەردەوام بە ئەشقی دەرنەبڕدراو و سات لە دوای سات پڕگڕوگڵپەتری دەبووە هۆی شەرمەزاری و تریق بوونەوەم. لێی دەترسام، ئەگەرچی ددانم بەو ترسەی خۆمدا نەدەنا. زۆرجار، نەخوازراوانە بیر و هۆشم لەلای ئەو بوو. مێردەکەم ئەوی دەناسی و ساردوسڕ و لووت بەرزانە هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکرد. بەڵام لەگەڵ ئەوانی دیکە وانەبوو کە بە چاوی مێردی ژنەکەی لێیان دەڕوانێ. کۆتایی وەرزی هاوین بوو کە من نەخۆش کەوتم و بۆ ماوەی دوو حەوتوو لە هۆتێل نەهاتمە دەرێ. شەوێک کە یەکەم جار دوای چاکبوونەوەم چوومە کۆڕێک بۆ گوێگرتن لە مۆسیقا، کە لە ماوەی نەخۆشییەکەمدا "لیدی س." کە وەسفی جوانییەکەی بەسەر زار و زمانانەوە بوو و ماوەیەکی زۆر بوو هەمووان چاوەڕوانی هاتنی بوون، ئاخری هاتبوو. کاتێک گەیشتمە نێو هۆڵەکە تاقمێک دەورەیان دام و بە شادمانییەوە پێشوازییان لێکردم. بەڵام گرووپێکی گەورەتر لە ناوبەدەرەوەکان لە دەوری ئەو بێگانە تازە هاتووە کۆ بووبوونەوە. لە دەور و پشتی من هەمووان باسی جوانیی ئەویان دەکرد. ئەویان پێشان من دا و بە ڕاستی دڵڕفێن بوو. بەڵام دەمارزلییەکەی نەکەوتە بەر دڵم و بیروڕای خۆم نەشاردەوە. ئەو شەوە هەرچی ڕوویدا لەبەر چاوم ناخۆش و جاڕزکەر بوو.

ڕۆژی دوایی"لیدی س." سەیرانێکی ڕێک خست. کە سەردانی کۆشکێکی خاپوور بوو و من لەو شاندەدا بەشداریم نەکرد. دەکریَ بڵێین هیچ کەس لەگەڵ من نەمایەوە و بیروڕام سەبارەت بە شاری بادێن بە تەواوی گۆڕا. هەموو شتێک و هەموو کەسێک لەبەر چاوم دزێو و بێزارکەر بوون. بەهۆی بێزاری و لەش داگیرانەوە دەمویست دەست بکەم بە گریان و هەرچی زووتر کۆتایی بە بەرنامەی گڕاو بێنم و بگەڕێمەوە بۆ ڕووسیا. هەستێکی تاڵ دڵی داگرتبووم کە هێشتا لەلای خۆم دانم پێدا نەنابوو. بۆیە لاوازی و لەش بەباریم کردە بیانوو و نەدەچووم بۆ کۆڕەکان. جاروبار بەیانی لە هوتێل دەچوومە دەرێ و بە تەنیا دەچووم بۆ گەرماوی گڕاو یان لەگەڵ "ل.م." کە خاتوونێکی ڕووسی و لە دەستە خوشکانی قەدیمم بوو لە دەوری شوێنی نیشتەجێ بوونەکەمان پیاسەمان دەکرد. مێردەکەم کە چاوەڕوانی کۆتایی هاتنی کاتی ئاو دەرمانییەکەی من بوو، چووبوو بۆ هایدلبێرگ و لەوێ ژووری هوتێلێکی گرتبوو و هێندێ جار دەهات بۆ سەردانم.

ڕۆژێک "لیدی س." هەمووانی بۆ ڕاو بانگ کرد. خاتوو"ل.م." و من و دووکەسی تر لەگەڵی نەچووین و دوای نانی نیوەڕۆ چووین بۆ کۆشک. بە سواری فەیتوون و زۆر بە هێواشی بە جادەی پێچەڵاوپووچ و بە نێوان دوو ڕیز دارەبەڕووی پیردا دەچووینە پێشێ و دیمەنی جوان و ڕازاوەی بادێن کە هەتا دەم ئاسۆ لەژێر پڕشنگی خۆری ئێوارەدا دەدرەوشایەوە، لە نێوان ساقەتەی ئەستووری درختە سەدساڵەکانەوە لێمان دەڕوانی و پێکەوە قسەمان دەکرد. "ل.م." کە لەمێژبوو دەمناسی سەرەتا وەک ژنێکی ڕۆحسووک و تێگەیشتوو دەهاتە بەرچاوم کە دەکرا سەبارەت بە هەموو شتێک لەگەڵی بدوێی و دەردەدڵی لەگەڵ بکەی و هاوڕێیەتییەکەی زۆر خۆش بوو. باسی بنەماڵە و منداڵەکانمان و ژیانی سەرسووکانە و بێ مانای ئەوێ و گەڕانەوە بۆ ڕووسیا و گوند و ژیانی ساکاری ئەوێمان دەکرد و هەردووکمان دڵتەنگ و بێ تاقەت بووین. بەو هەستەوە گەیشتینە کۆشک. لە نێوان دیوارە لاڕووخاوەکاندا هەواکەی فێنک و تاریک بوو. هەتاوێکی بێ تین سەردیوارەکانی زەرد داگێرابوو و بە نەرمی گیانی پێ دەبەخشین. دەنگی قسە کردن و هەنگاویش دەهاتە گوێ. دیمەنی دڵگری بادێن لە دوورەوە کە لەبەر چاوی ئێمەی ڕووس هێندێک بێ تام دیاربوو لە نێو

کۆشکەکەوە دیار بوو، دەتگوت وێنەیەکە و لە قەتحە گیراوە. بە مەبەستی تۆزێ حەسانەوە دانیشتین، بێدەنگ چاومان لە ئێوارە و زەردەپەڕ دەکرد. دەنگی ئاخافتنەکە نزیک تر بۆوە و بە جوانی دەمان بیست و لەپڕدا هەستم کرد ناوی خۆم گوێ لێ دەبێ. بەڵێ وابوو، گوێم شل کرد و وشەکانم بە ڕوونی دەبیست. دەنگەکان بە گوێم ئاشنا بوون. بەڵێ،"مارکی د." بوو لەگەڵ گەنجە فەڕەنسییەکە ومن ئەویشم دەناسی. باسی من و "لیدی.س."یان دەکرد و گەنجە فەڕەنسییەکەمنو ئەوی پێکەوە هەڵدەسەنگاند و لایەنە جۆراوجۆرەکانی جوانی و بەژن و بالأمانیی مووبەموو شی دەکردەوە. ئەوەی دەیگوت بە ڕاستی ناخۆش نەبوو. بەڵام کە بە وردی گوێم بۆ قسەکانی شل کرد و لێی حاڵی بووم دڵم کەوتە لێدان. ئەو جوانییەکانی ئێمەی بە وردی شرۆڤە دەکرد. بە بڕوای ئەو من زگێکم کردبوو و بەڵام "لیدی.س." تەنیا نۆزدەساڵی تەمەن بوو. سەروقژی من لە هی خەنیمەکەم جوانتر بوو. بەڵام لەش و لاری "لیدی س." دڵڕفێنتر بوو. دەیگوت: «گەورەیی و فیزی "لیدی س." بە ڕاستی شاهانەیە بەڵام "نیچێرەکەی تۆ" لەوبارەوە شتێکی هێندە تاقانە نییە. یەکێک لەو پرەنسسە ڕووسیانەیە کە لە هەموو شوێنێک دەکەونە بەرچاو و دەکرێ بڵێین هەڵڕژاون.» قسەی کۆتایشی ئەوە بوو کە من دەبێ ئاقڵ بم لەلای "لیدی.س." خۆم دەرنەخەم چونکە لە شوێنێک کە "لیدی.س"ی لێبێ من تۆزی بانانم.

دەنگی ئەوەی دیکەیان بە شێوەزاری ئیتالیایی هاتە گوێم کە بە لەبزێکی توند و قایم و ناحەز گوتی: «ئەگەر ئەو بڕوا من بە دوایدا دەڕۆم.» لاوی فەڕەنسی بە پێکەنینەوە گوتی: «خۆزگەم بە خۆت کە بەڕاستی دڵێکی سادەت هەیە و هێشتا ئەو دڵە ناسکەت توناییی ئەشق و خۆشەویستیی هەیە!»

ئەوی دیکەیان وەڵامی دایەوە: «ئەشق و خۆشەویستی...» دوای گت گرتنێک درێژەی پێدا: «... من دەست لە ئەشق و خۆشەویستی هەڵگرم! من بەبێ ئەشق ناتوانم هەناسە بکێشم. تەنیا کارێک کە بایی زەحمەتەکەی دەبێ دڵدارییەکی هەمیشەیییە، دڵدارییەکانی منیش قەت بە نیوەچڵی نامێننەوە. ئەمجارەش هەتا کۆتایی دەچمە پێشێ.

لاوه فەڕەنسییەکە گوتی: «Bonne chance mon ami!»[١٨] لەوە زیاتر قسەکانیانمان نەبیست. چونکە لە حاستی دیوارەکە تێپەڕیبوون و ئێمە ترپەی پێیانمان لە لایەکی دیکەوە دەبیست. بە قاڵدرمەکاندا هاتنە خوارێ و دوای چەند خولەکە لە دەرگای ئەو لاوە هاتنە ژوورێ. کە چاویان بە ئێمە کەوت ماق مان. کاتێک "مارکی.د." لێم نزیک بۆوە سوورهەڵگەڕام و لە کاتی چوونە دەرێ لە کۆشکەکە قۆڵی هێنایە پێشێ کە قۆڵ بخەمە قۆڵی بەڵام ترسام. لەگەڵ ئەوەشدا نەمتوانی دەستی بە ڕووەوە بنێم بە کارێکی جوانم نەدەزانی و قۆڵم خستە قۆڵی بە ئارامی بە دوای "ل.م."دا کە شان بە شانی گەنجە فەڕەنسییەکە دەڕۆیشت چووین بۆ لای فەیتوونەکە. قسەی لاوە فەڕەنسییەکە زۆری ڕەنجاندبووم و هەڵبەت لە دڵی خۆمدا هەقیشم پێدەدا و دەمزانی ئەوەی هەستی پێدەکەم ئەو بە زمان دەریبڕیوە. بەڵام بە قسەکانی "مارکی.د." کە ڕەق و تەق و دوور لەناسکی بوون سەرم سووڕما و ڕقم هەستا بوو. ئەوەم زۆر پێ ناخۆش بوو کە گوێم لە قسەکانی دەبوو و ئەو بە بای خەیاڵیشیدا نەدەهات و هیچ شەرم شکۆیەکی لە قسەکانی خۆی نەبوو. لەوەی کە ئاوا بە خێرایی لەگەڵی کەوتبووم و شان بە شانی دەڕۆیشتم و قۆڵم لە قۆڵی کردبوو هەستم بە بێزاری و نەفرەت دەکرد و بێ ئەوەی چاوی لێ بکەم یان وەڵامی بدەمەوە هەوڵم دەدا قۆڵی جۆرێک بگرم کە هەستی پێ نەکەم و بە دوای "ل.م." و گەنجە فەڕەنسییەکەدا دەڕۆیشتم و جارلەگەڵ جار هەنگاوەکانم توندتر دەکرد. مارکی باسی جوانیی دیمەنی ئێوارە و سروشتی دەکرد و دەیگوت بەختەوەرە کە لەم کاتە جوان و لە بارەدا چاوی بە من کەوتووە، هەروەها دەیگوت کە قەت چاوەڕوانی ئەو هەلە خۆشەی نەکردووە و لەو جۆرە قسانە. بەڵام من هەمیەتم بە قسەکانی نەدەدا. لەو کاتە خەیاڵم لای مێردەکەم بوو و بیرم لە کوڕەکەم و لە ڕووسیا دەکردەوە. هەستم بە پەشیمانی دەکرد و مەیل و تاسەیەکی لێڵم لە دڵدا بوو و ئاراوقارا لێ هەڵگیراو دەمویست هەتا زووە بگەمەوە ماڵێ، بخزێمە خەڵوەتی ژوورەکەم لە Hotel de bade، تاکوو بە ئاسوودەیی و لە دەرفەتی لە باردا بیر لەو هەستانە بکەمەوە کە لەو کاتەدا دڵی خستبوومە گێژەنەوە. بەڵام "ل.م." زۆر بە هێواشی هەنگاوی دەنا و

[١٨] سەرکەوتوو بی هاوڕێی بەڕێز!

هێشتا مەودایەکی زۆرمان مابوو بگەینە لای فەیتوونەکە. دەمزانی لاوەکەی هاوڕێم پێداگری دەکات کە هێواشتر هەنگاو هەڵگرین و دەتگوت دەیهەوێ ڕامگرێ. لە دڵی خۆمدا گوتم: «مەگین شتی وادەبێ! ڕووهەڵماڵدراویش ڕادەی خۆی هەیە!» بە بڕیارێکی لێبڕاوانە هەنگاوم خێراتر کرد. بەڵام ئەو بە ئاشکرا دەیویست ڕامگرێ و قۆڵی توند گرتبووم کە نەڕۆم. "ل.م." بە پێچی ڕێگایەکدا بایدایەوە و لەبەر چاو ون بوو و ئێمە بە تەنیا ماینەوە. ترسێک سەرتاپای داگرتم و ڕەنگم هەڵبزرکا.

بە ساردی گوتم: «ببوورە!» دەمویست قۆڵ لە قۆڵی دەرکێشم. بەڵام تۆڕی سەرقۆڵم لە قۆپچەی سەردەستی کراسەکەی گیرا بوو. ئەو بەسەر دەستمدا نووشتا بۆوە و هەوڵی دەدا قۆپچەکە لە تۆڕەکە بکاتەوە و قامکی لە مەچەکم دەدرا و ئەوە بۆ من هەستێکی تازە بوو. هەستێک کە نیوەی ترس و نیوەی چێژ بوو، وەکوو مۆچرکێکی سارد لە مۆغەرەی پشتم گەڕا. سەرم هەڵێنا و چاوم لە ڕوخساری کرد تاکوو تەواوی ئەو سووکایەتییەی سەبارەت بە ئەو لە دڵمدا بوو بیدەم بە دەموچاویدا. بەڵام ڕوانینم هیچ سووکایەتییەکی پێوە نەبوو و جگە لە ترس و پەشۆکان هیچ شتێکی تری لەخۆ نەگرتبوو. چاوە پڕ ترووسکە و جوانەکانی بە شێوەیەکی سەیر لە چاوم چەقیبوون. چاوانی لەگەڵ دەمووچاوم مەودایەکیان نەبوو و سەیری سینگ و بەرۆکی دەکردم. دەستەکانی نەرماییی مەچەکی گرتبووم و دەیگوشی و بە نەرمی قامکی پێدادێنا و لێوە نیوە کراوەکانی شتێکیان بە من دەگوت. دەیگوت خۆشی دەوێم و من هەموو شتێکم بۆ ئەو و لێم نزیکتر دەبۆوە و دەستەکانی مەچەکی توندتر دەگوشیم و دەیسووتاند. خوێنم گەرم داهاتبوو و وەک ئاور بە دەمارەکانمدا تێدەپەڕی و بەر چاوم تاریک بوو. دەلەرزیم و ئەو وشانەی کە دەمویست بە یارمەتیی ئەوان لەو کارەی دەیکرد پاشگەزی بکەمەوە لە گەروومدا گیریان دەکرد و لەسەر لێوم ویشک دەبوون. لە ناکاو ماچێکم لەسەر ڕوومەتم هەست پێکرد و بە جەستەیەکی سڕ و سەهۆڵ ئاساییەوە، لە جێی خۆم ویشک بووم و چاوم لە چاوی بڕی. وەک مێوژۆکە دەلەرزیم و توانایی جووڵان یان قسەکردنم نەبوو. سەرتاپا ببوومە ترسێکی چاوەڕوان و ئەوم دەویست... هەموو ئەوانە تەنیا ساتێکی خایاند، بەڵام ئەو

ساته زۆر ترسناک بوو! لەو ساتەدا سەرتاپای ئەوم ڕاست بەو شێوەیە کەبوو، بینی. خەت و لۆچی ڕوخساری لە زەینمدا چەسپا. نێوچاوانی کە لە مێردەکەم دەچوو لەژێر کڵاوە حەسیرییەکەدا دەمدی و لووتی قەڵەمی و جوانی کە پەڕەکانی سوورایییان تێگەڕا بوو و سمێڵی قەیتانی و تۆزی چەور کراوی و ڕیشی چەناگەی و گۆنای تیفتیفە دراوی و لاملی گەنم ڕەنگ و خۆر گەزیوی هەموویان خۆیان لە کانیاوی ڕوانینم هەڵکێشا بوو. لێی بێزار بووم و دەترسام، چونکە زۆر نامۆ بوو بە لامەوە. بەڵام لەو ساتەدا شڵەژاوی و سۆز و ئەشقی ئەم غەوارە ڕەزاگرانە لە دڵمدا کاردانەوەیەکی بەهێزی هەبوو. حەزێکی بە کوڵ و تامەزرۆییەکی نامۆ وای لێکردم خۆم بۆ ماچی ئەو لێوە جوان و نانەجیم و ناسکانە شل کەم و گوشاری ئەو دەستە سپی و سۆڵ و نەرمانەی کە دەمارە شین و باریکەکانی دیار بوون تەزووی شیرین لە هەناوم بگێڕێ و قامکە شووش و بە ئەنگوستیلە ڕازاوەکانی زەندی نەرموشلی دەستم بلاوێنێ و وەک شێت و خولیایەک خۆم بخەمە نێو قووڵایی گێژاوێکەوە کە لە ناکاو لەبەر پێمدا زاری کردبۆوە و بەرەو چێژێکی نامۆ هانی دەدام...

بە خۆمم گوت: «پەککوو چەند چارەڕەشم! لێگەڕێ با بەدبەختی لەوە زیاتر لەسەر شانم بار بێ.»

یەکێک لە باسکەکانی لە دەوری نێوقەدم هاڵاند و دەمی هێنا بۆ دەمم. «لێگەڕێ با دیواری شوورەیی و تاوان لەوە زیاتر، زۆر لەوەش زیاتر بەسەرمدا بڕوخێ!»

بە دەنگێکی شێوەی دەنگی مێردەکەم و بە هێواشی گوتی: «je vous aime!»[١٩]

یادی مێردەکەم و کوڕەکەم وەک دوو بوونەوەر کە سەردەمێک خۆشەویستم بوون، لە زەینمدا زیندوو بۆوە. بەڵام هەموو شتێک لە نێوان ئێمەدا تەواو بووبوو. لەو کاتەدا دەنگی"ل.م." کە بانگی منی دەکرد لەو دیوی پێچی ڕێگاکەوە هاتە گوێم. دیسان وەخۆ هاتمەوە. قۆڵم لە قۆڵی دەرکێشا و بێ ئەوەی چاو لە چاوی بکەم بە هەڵەداوان بەرەو لای دەنگی "ل.م." ڕۆیشتم. سواری فایتوون بووین. ئەو کاتە سەرم هەڵبڕی و چاوم لە ئەو کرد. کڵاوەکەی لەسەری داگرت و بە پێکەنینەوە

---

[١٩] خۆشم دەوێی!

شتێکی لێ پرسیم. ئاگای لەو نەفرەتە خامۆشە نەبوو کە لەو ساتەدا سەبارەت بە ئەو لە دڵم هەڵدەقوڵی.

ژیان لەبەر چاوم ڕەش داگەڕا بوو، ڕابردووم تاریک بوو و هیچ هیوایەکم بە داهاتوو نەبوو. "ل.م." قسەی دەکرد و من لێی تێ نەدەگەیشتم دەڵێ چی. هەستم دەکرد تەنیا لەبەر بەزەیی پێداهاتن قسە دەکات، دەیویت ئەو هەستی سووکایەتییەی کە سەبارەت بە من هەیبوو لەژێر پەردەی چەنەوەریدا بشارێتەوە. لە دانەبەدانەی وشەکانی و ڕوانینەکانیدا ئەم سووکایەتییە و ئەم بەزەییە پڕ ئازارەم دەدی. جێگای ماچەکە لەسەر ڕوومەتم بە ئاوری شەرمێک دەسووتا و بیری مێرد و کوڕەکەم ئاراوقارای لێ هەڵگرتبووم. بە هیوابووم کاتێک لە ژوورەکەم تەنیا کەوتم بیر لە بارودۆخ و حاڵی خۆم بکەمەوە بەڵام زۆر لە تەنیایی دەترسام. کە چاییان بۆ هێنام نیوەیم خواردەوە و نامە ئەولاوە، بە پەلە و پەشۆکاو دەستم کرد بە پێچانەوەی بارگەوبنە تاکوو بە شەمەندەفەری ئەو شەوە خۆم بگەیەنمە هایدلبێرگ و بچم بۆ لای مێردەکەم.

کاتێک لەگەڵ خزمەتکارەکەم لەنێو ڤارگۆنی خاڵیدا دانیشتم و شەمەندەفەر وەڕێ کەوت هەوایەکی تازە و فێنک لە پەنجەرەکەوە لە ڕوخساری دام. وردە وردە هۆش و گوشم خڕکردەوە و بە ڕوونی بیرم لە ڕابردوو و داهاتووی خۆم کردەوە. تەواوی ژیانی هاوبەشیم لەو کاتەوە کە لە پترزبۆرگ نیشتەجێ بووین وەک تیشکێکی تازە هاتە بەرچاوم و وەکوو بارێکی قورسی پڕ تانە و توانج لەسەر ویژدانم قورسایی دەکرد. بۆ یەکەم جار هەوەڵین دەورانی ژیانی ژنومێردایەتیم لە گوند، بەو بەرنامانەوە کە بۆ داهاتوومان گەڵاڵە کردبوو، بە ڕوونی وەبیر هاتەوە و یەکەم جار ئەو پرسیارە لە زەینمدا سەری هەڵدا: «ئەو لەو ماوەیەدا دڵی بە چی خۆش کردووە؟» تەزوویەک بە دڵمدا هات و خۆم زۆر بە تاونبار هاتە بەرچاو. لە دڵی خۆمدا گوتم: «بەڵام ئاخەر بۆچی ڕێگای لێ نەگرتم؟ بۆ لەگەڵمدا دوو ڕوو بوو؟ بۆچی کڵوکۆی دڵی خۆی هەڵنەڕشت و کێشەکانی نێوانمانی شی نەکردەوە؟ بۆ دڵی ڕەنجاندم؟ بۆ وزەی ئەوینی خۆی بە کار نەهێنا؟ ڕەنگە هەر خۆشی نەویستبێتم!» بەڵام تاوانی ئەو هەرچییەک بوو سۆڵانەوەی ماچی ئەو گەنجە غەوارەیە لەسەر ڕوومەتم هەروا مابۆوە و من

هەستم پێ دەکرد. هەتا لە هایدلبێرگ نزیکتر دەبوومەوە ڕوونتر مێردەکەم دەهێنایە بەر چاوی خۆم و دیداری داهاتوومانم سامناکتر دەهاتە بەرچاو، بەخۆمم گوت: «هەموو شتێکی بۆ باس دەکەم. ژاری ئەو تاوانە بە فرمێسکی پەشیمانی لەسەر دڵم دەسڕمەوە و ئەو لێم خۆش دەبێ.» بەڵام خۆم نەمدەزانی ئەم «هەموو شتە» کە بۆی باس دەکەم چییە؟ بڕواشم نەدەکرد لێم خۆش بێ.

که پێم نایە ژووری مێردەکەمەوە و ڕوخساری ئارامی، ئەگەرچی تاڕادەیەک واق ورمانی پێوە دیار بوو کەوتە بەرچاوم، هەستم کرد هیچ شتێکم بۆ گوتن نییە پێی بڵێم. چ دانپێدانانێک؟ بۆ چ تاوانێک داوای لێبوردن بکەم؟ ژاری خەفەت و باری پەشیمانی هەروا لەسەر دڵم دەمایەوە و ئۆقرەی لێ دەبڕیم.

گوتی: «ئەوە چ کارێکە؟ من دەمویست سبەینێ بێم بۆ لات.» بەڵام کاتێک لە ڕوخسارم ڕاما، وەک ئەوەی ترسی لێ نیشتبێ، پرسیی: «چییە؟ چی بووە؟»

به زەحمەت توانیم ددان بە خۆمدا بگرم و نەگریم، تفی زارم قوت دایەوە و گوتم: «هیچ نییە. هیچ نەبووە! ئیتر لێرە بێزارم، بابگەڕێینەوە! ئەگەر دەلوێ با هەر سبەینێ وەڕێ بکەوین! دەچینەوە بۆ لای ماڵ و حاڵەکەمان، بۆ وڵاتی خۆمان!»

ماوەیەک ڕاوەستا و چاوی لە ڕوخسارم بڕی. ئاخری گوتی: «بۆ پێم ناڵێی چی ڕووی داوە؟»

بێ ئیختیار سوور هەڵگەڕام و سەرم داخست. شوێنەواری زویری و تووڕەییم لە چاوانیدا دی. ئەو فکر و خەیاڵانەی لە زەینیدا زەق دەبوونەوە ترسیان دەشکاندە نێو گیانم و بە وزەیەکی درۆ و حاشا کردنەوە کە لە خۆمدا پێم شک نەدەهات گوتم: «هیچ نەبووە. تەنیایی بێزاری کردووم و ئیتر تاقەتم لێبڕاوە. زۆرم بیر لە ژیانمان و لە تۆ کردەوە. زۆر لە مێژە خۆم بە تاوانبار دەزانم و ئەگەر تۆ لێم خۆش نەبی ژیان لەبەر چاوم تاریک دەبێ. بۆچی لەگەڵم دێی بۆ جێگایەک کە حەزت لێ نییە؟» دووپاتم کردەوە: «زۆر لە مێژە دەرهەق بە تۆ خۆم بە تاوانبار دەزانم!» دیسان فرمێسک لە چاومدا قەتیس ما. «بابگەڕێینەوە بۆ گوندەکەمان، بۆ هەمیشە!»

به ساردی گوتی: «ئاخ، خۆشەویستەکەم، تۆخودا دەست لەو یاریی هەست و سۆزە هەڵگرە. ئەوەی کە دەتەوێ بگەڕێینەوە بۆ لادێ زۆر باشە. چونکە ئیتر

پارەیەکی زۆرمان بۆ نەماوەتەوە. بەڵام ئەوەی کە گوتت بۆ هەمیشە ئەوە خەون و خەیاڵە. دڵنیام لە گوند ماوەیەکی زۆر تاقەت ناهێنی. ئێستا وەرە چاییەک بخۆ با حاڵت بێتەوە سەرخۆ.» باسەکەمان بەو ڕستەیە کۆتایی پێ هێنا و هەستا بانگی پێشخزمەتەکە بکات.

ئەو خەیاڵانەی کە وێ دەچوو سەبارەت بە من لە مێشکیدا بێ دەمهێنایە بەر چاوی خۆم و بە دیتنی چاوی پڕ لە گومان و حاڵە شێواوەکەی، پێموابوو سەبارەت بە من بیر دەکاتەوە و بیرێکی تاڵ و ڕەش مێشکی تەنیوە، خەم دایدەگرتم و لە دڵی خۆمدا دەمگوت: «نا، ئەو حەز ناکات و ناتوانێ لە حاڵی من تێبگات!» گوتم دەچم بۆ لای کوڕەکەمان و بەو بیانووە بەجێم هێشت. تەنیا دەمویست بە تەنیا بم و بگریم.

## نۆ

ماڵە چۆڵ و هۆڵەکەمان لە نیکۆلسکایا کە ماوەیەکی زۆر بوو گەرم دانەهاتبوو، دیسان گیانی تێگەڕایەوە، بەڵام دانیشتووانی هەروا مات و دڵ مردوو بوون. خەسووم نەمابوو و ئێمە دوو کەس وشک و بێ هەست پێکەوە بووین. نەک لە بیری پێکەوە بوون و چێژ وەرگرتندا نەبووین بەڵکوو بە پێچەوانە ئەو تەنیاییە زۆریشی ئازار دەداین. زستانمان زۆر بە دژواری ڕابوارد. بە تایبەت بەو هۆیەی کە نەخۆش کەوتم و تازە دوای لە دایک بوونی دووهەم کوڕمان بوو برێک چاکتر بوومەوە. پێوەندیم لەگەڵ مێردەکەم هەروا دۆستانە بەڵام زۆر ساردوسڕ بوو. ڕاست وەک ئەو کاتەی لە شار بووین. بەڵام لە گوند، هەموو تەختەی چێوفەڕشی تەرکی ژوورەکان و هەموو دارودیوار و قەنەفەکان بۆ من بیر هێنەرەوەی ڕابردوو بوون و وەبیری دەهێنامەوە کە لە ڕابردوودا چیم لە دەست داوە. دەتگوت بێ ڕێزییەکی گەورە لە نێوانماندا ماوە کە بۆ بەخشین نابێ. وەک ئەوە وابوو من لەسەر تاوانێک سزا بدات کە وای دەنواند زۆر کەمتەرخەمانە و بە سەرساردییەوە چاوی لێ بکات. هەڵبەت داوای لێبووردن و بەخشین نابەجێ

نەبوو. سزادانی من تەنیا بۆ ئەوە بوو کە ئەو ئیتر وەک ڕابردوو سەرتاپای وجوودی و تەواوی ڕۆحی خۆی بۆ من تەرخان نەدەکرد. بەشێکی ڕۆحی خۆی نەک هەر بۆ من بەڵکوو بە هیچ کەس و هیچ شتێک نەدەدا. دەتگوت ئیتر ڕۆحی نییە تاکوو گیانی پێ بکات بەبەری کەسێکدا. هێندێ جار پێموابوو تەنیا وا دەنوێنێ کە ئەو جۆرەیە و بۆیە وا دەکا تاکوو من ئازار بدات. دەنا هەستی ڕابردوو هێشتا لە ناخیدا بە ئاگایە و هەوڵم دەدا بیجووڵێنم تاکوو ڕاز و نهێنییەکانی ناخی وەدەربخات و بێتە زمان. بەڵام هەمووو جارێک وەک ئەوە وابوو کە لە دەست یەکدڵی ڕابکات و پێی وابێ لەگەڵی یەکڕەنگ نیم و تەنیا بە ڕواڵەت وادەنوێنم و دەترسا درکاندنی خۆشەویستی و نهێنییەکەی قوڕ و بێ تام دەرچێ. ڕوانین و لەبزی ئاخافتنی دەیگوت: «من هەموو شتێک دەزانم. هەموو شتێک! قسە کردن بێ کەڵکە. ئەوەی دەتەوێ پێمی بڵێی من لەو سەری دێمەوە. ئەوەش دەزانم کە بە زمان شتێک دەڵێی و کارەکانت ڕوویان لە شوێنێکی ترە.» سەرەتا ئەو لە یەکڕەنگی ترسانەی ئازاری دەدام. بەڵام دواتر پێی ڕاهاتم و زانیم کە کێشەی ئەو شێواندنی سەداقەت نییە بەڵکوو ئەوەیە کە جگە لەو هەستە پێویستی بە هیچ سەداقەتێکی تر نییە. ئێستا ئیتر من زمانم نەدەگەڕا کە کتوپڕ بڵێم خۆشم دەوێی یان داوای لێبکەم دۆعام لەگەڵ بخوێنێ یان بەلامەوە دانیشێ و پیانۆی بۆ بژەنم. جۆرێک بەڵێنی خووخدە و هەڵسوکەوتی باش لە نێوانماندا دامەزرا بوو. هەرکام وەک خۆمان دەژیاین. ئەو سەرقاڵی کارەکانی خۆی بوو کە من هەستم نەدەکرد پێویستم پێیانە و حەز بکەم یارمەتیی بدەم یان لەو ئیشەدا بەشدار بم، خۆشم لەگەڵ کات بە فیرۆدان ڕاهاتبووم کە بە پێچەوانەی ڕابردوو ئیتر ئەو ناڕەزایەتیی دەرنەدەبڕی و خۆی پێوە ناڕەحەت نەدەکرد. منداڵەکانیشمان هێشتا لەوە چکۆڵەتر بوون کە ئێمە یەک خەنەوە و دڵمان پێکەوە گرێ بدەنەوە.

بەهار هات و کاتیا و سۆنیا هاتن تاکوو هاوین لە گوند بمێننەوە و نۆژن کردنەوە و گەورە کردنەوەی بیناکەی نیکۆلسکایا پێویست بوو و کاروباری بیناسازی دەستی پێکرد. ئێمەش ماڵوکۆچمان بۆ پۆکرۆڤسکۆڤیا گوێستەوە. ماڵە کۆنەکەی پۆکرۆڤسکۆڤیا هەر وەکوو پێشوو وابوو. ساباتەکە و ئەو مێزەی

دەنووشتایەوە و پیانۆکەش هەر لە هۆڵە تاوگرەکە بوو، ژوورەکەم بە پەردەی سپییەوە، دەتگوت خەونەکانی کاتی کچێنیم لەوێدا خۆیان حەشار داوە و خەوتوون. دوو قەرەوێڵە لە ژوورەوە بوون. یەکیان تەختە خەوی ئەو کاتەی خۆم بوو کە ئێستا کاکووشای خرپنەم لەسەر دەخەواند و ئەوی دیکەشیان بێشکەیەکی چکۆڵە بوو کە دەموچاوی خڕ و چکۆڵەی ڤانیا لە نێویدا دیار بوو. شەوانە دوای ئەوەی خاچی کوڕەکانم دەکێشا زۆرجار لە نێوەڕاستی ژوورەکە بە ئارامی ڕادەوەستام و لە ناکاو وێنەگەل و بیرەوەریی پڕ خەیاڵی ڕابردوو، دیمەنی یادەوەری قەدیمی و ڕووداوی فەرامۆش کراوی کاتی منداڵی و کاتی عازەبیم لە هەموو سووچ و قوشبنی دیوار و بن پەردەکان دەهاتنە دەرێ و دەنگە قەدیمییەکان گۆرانییەکانی سەردەمی جحێڵیی منیان دەگوت. ئەم وێنە خەیاڵییانە و ئەم گۆرانییە دڵبزوێن و شیرینانە لە کوێ مابوونەوە؟ ئەو هیوا و ئاواتانەی کە سەردەمێک بە پووچ و بێ بنەمام دەزانین هەموویان هاتبوونە دی. خەون و خولیا ونبووکانم لە تەمومژ و پەرێشانیدا ببوونە ڕاستەقینە و ڕاستەقینە وەکوو ژیانێکی پڕ کێشە و نالەبار و خاڵی لە شادی و هیوای لێ هاتبوو. هەموو شتێک بە شێوەی پێشوو بوو. باخەکە هەروا لە پەنجەرەی ژوورەکەوە دیاربوو و باخچەکە و توولەڕێی تەنیشتی و کورسییە کۆنەکە کە لە قەراغ شیوەکە هەڵکەوتبوو. چریکەی بولبولان وەک ڕابردوو لەلای ئاقزێڵەکەوە دەهاتە گوێ و یاسە بنەوشەکە باڵای بە گوڵ داپۆشرابوو و مانگە شەو وەک ئەو سەردەمە ماڵ و باخەکەی تریفەباران دەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا هەموو شتێک گۆڕانی بەسەردا هاتبوو و ئەویش لەگەڵ ئەوەی ترسناک بوون، جێی باوەڕیش نەبوون! ئەو شتانەی کە دەکرا زۆر دڵگر و نزیک بن هەمووی ساردوسڕ و دوور بوون. من و کاتیا وەک ڕابردوو بە بێدەنگی لە هۆڵەکە دادەنیشتین و باسی ئەومان دەکرد. بەڵام دەموچاوی کاتیا بە پێچەوانەی ڕابردوو چرچولۆچ و زەردەڵ بوو و بریقەی شادی و هیوای ئەو ڕۆژانە جێی خۆیان دابوو بە هەستی هاودەردی و دڵسۆزی و کەسەر.

دڵمان ئیتر وەک ڕابردوو لێوڕێژ لە سۆز و تاریفاتی ئەو نییە، بەڵکوو بە خوێن ساردییەوە داوەریی لەسەر دەکەین و ئیتر سەرمان لەوە سووڕنامێنێ کە

چیمان کردووە شایانی بەختەوەرییەکی لەو شێوە بین. ئیتر حەزمان لێ نییە بیروڕای خۆمان دەربڕین. وەک پیلان داڕێژان بە سرتە قسە دەکەین و بۆ سەدەمین جار بە خۆمان دەڵێین چی بوو کە کارەکە بەو جێگایە گەیشت؟ مێردەکەشم هەر بەو شێوەیە بوو، تەنیا لۆچی نێوان برۆکانی قووڵتر بووە و مووی سپیی لاڕوومەتی زیاتر بووە، نیگای وردبین و مووقەڵێشی کە سەردەمێک لە هیچ خافڵ نەبوو ئێستا لەژێر پەردەی ناڕوونی خەیاڵدا شاردرابۆوە و پارێزی لە چاوانی من دەکرد. منیش هەر ئەوەم کە بووم تەنیا ئەوەندە نەبێ دڵم لە ئەشق و خۆشەویستی خاڵییە. پێویستم بە هەست و سۆز نییە و لەخۆم ڕازی نیم. سۆزی ئایینی و حاڵ لێهاتنی ئەشق و ڕەزایەت لە جوانیی ژیان لەبەر چاوم بۆ ڕابردوویەکی زۆر دوور گەڕابوونەوە و دەتگوت ئیتر مەحاڵە پێیان بگەم. ژیان و ئاسوودەیی بۆ هاوڕەگەز، کە سەردەمێک بە کارێکی درووستم دەزانی و لایەنگری بووم، ئەمڕۆ زۆر بە دژواری تێی دەگەیشتم. ژیان بۆ هاوڕەگەز، لە جێیەک کە حەزم لە ژیان بۆخۆشم نییە ئیتر چ مانایەکی هەیە؟

لەو ڕۆژەوە کە چووین بۆ پترزبۆرگ مۆسیقام ماچ کردبوو و نابوومە ئەو لاوە. بەڵام ئێستا پیانۆ قەدیمییەکە و دەفتەری کۆنی نۆتەکان سەر هەوای خستبوومەوە و دڵی بە ئاگا هێنابووم.

ڕۆژێک کە نەخۆش بووم و لە ماڵێ بە تەنیا مابوومەوە، سۆنیا و کاتیا لەگەڵ مێردەکەم چووبوون بۆ نیکۆلسکایا تاکوو سەردانی کاروباری بیناسازییە تازەکە بکەن. مێزی چایی خواردنەوە ئامادە کرابوو. چوومە خوارێ و گوتم باهەتا ئەوان دەگەڕێنەوە هێندێک پیانۆ بژەنم. چوومە پشت پیانۆکە و دەفتەری نۆتەی سۆناتم quasi una fantasia کردەوە و دەستم کرد بە ژەنین. هیچ کەسم نەدەدی و ترپەی پێی کەسم نەدەبیست. پەنجەرەکان بەرەو ڕووی باخەکە کرابوونەوە و دەنگی مۆسیقا، دڵهەژێن و پڕ شکۆ ژوورەکەی داگرتبوو. بەندی یەکەمم کۆتایی پێ هێنا و بێ ئیختیار و بە پێی خووخدەی قەدیم ئاوڕم بۆ لای ئەو سووچە دایەوە کە ئەو لە ڕابردوودا لێی دادەنیشت و گوێی بۆ ئەو ئاهەنگە ڕادەگرت کە دەمژەنی. بەڵام ئەو لەوێ نەبوو و کورسییەکەی کە لە مێژبوو لە جێی خۆی نەجووڵابوو، خاڵی بوو. لک و پۆپی چڕوپڕ و بە گوڵ داپۆشراوی

یاسی بنەوش لەبەر پڕشنگی زێڕینی خۆری دەمەو ئێوارە لە پەنجەرەکەوە دیار بوو فێنکایی شنەی بای ئێوارە دەهاتە ژووری. هەردوو هەنیشکم لەسەر پیانۆکە دانا و دەموچاوم نایە سەر لەپی هەردوو دەستم و بە گۆمی قووڵی بیروخەیاڵدا ڕۆچووم. ماوەیەکی زۆر بەو شێوەیە مامەوە و ڕابردوویەک کە ئیتر نەدەگەڕایەوە بە دڵتەنگی مروورم کردەوە، شەرمنانە هەوڵم دەدا وێنەیەک لە داهاتوو بهێنمە بەرچاوی خۆم، بەڵام دەتگوت هیچ شتێکم لە پێش نییە و دەرگای داهاتووم لێ داخراوە. دەتگوت هیچ تاسە و هیوایەکم نەماوە. بە ترسەوە سەرم هەڵێنا و بە خۆمم گوت: «یانی ژیانم گەیشتۆتە کۆتایی؟» بۆ ئەوەی ئیتر بیر نەکەمەوە و هەموو شتێک لە بیر بەرمەوە دیسان دەستم کردەوە بە پیانۆ ژەنین. هەر ئەو بەندەی **"ئاندانتە"**م لێدایەوە. لە دڵی خۆمدا گوتم: «خودایە، ئەگەر خەتابارم لێم خۆشبە. یان سەفای ڕۆحم بۆ بگێڕەوە. یان ڕێنماییم بکە چ بکەم؟ چۆن دەبێ بژیم؟» خڕەی تایەی فەیتوونێک لە ڕێگای خیزڕێژ کراوی بەر پلیکانەکانەوە هاتە گوێ. پاشان ترپەی هەنگاوێکی ئاشنام بیست، بە پارێزەوە بە ژێر ساباتەکەدا دەهات و ڕاوەستا. بەڵام ئەو هەنگاوە ئاشنایانە ئیتر ئەو هەستەی ڕابردوویان لە دڵمدا هەڵنەگیرساند. کە کۆتاییم بە ژەنینی هەواکە هێنا ترپەی هەنگاوەکە هاتە پشت سەرم و دەستی نایە سەرشانم.

گوتی: «کارێکی باشت کرد ئەو سۆناتەت ژەنی!»

من بێدەنگ بووم.

ـ«چاییت نەخواردۆتەوە؟»

سەرم لەقاند کە نا و ڕووم بۆلای وەرنەسووڕاند تاکوو شوێنەواری پەشۆکان کە بە ڕوخسارمەوە دیاربوو نەیبینێ و لێی بشارمەوە.

گوتی: «ئەوان ئێستا دەگەنەوە. ئەسپەکە چەمووش و کوڕەگوێ بوو هەڵیدەتیزاند. لە کاروانە ڕێکە چووینە دەرێ ئیتر ئەوان دابەزین و گوتیان بە پێیان دێینەوە.»

گوتم: «لەسەریان ڕاوەستین!» پاشان چووم بۆ ژێر ساباتەکە بەو هیوایەی بە دوامدا بێت بۆ ئەوێ. بەڵام ئەو حاڵی منداڵەکانی پرسی و چوو بۆ ژوورەکەیان. هەنتەشی ئەو و دەنگە دڵنشینەکەی جارێکی تر هەستی هیوابڕاویی لە دڵم دوور

خستەوە. لە دڵی خۆمدا گوتم: «ئیتر چیم لە خودا دەوێ؟ ئەو پیاوێکی باش و میهرەبانە. باوکێکی باش و مێردێکی دڵسۆزە. من نازانم ئیتر چ کەمایەتییەکم هەیە؟» چووم بۆ بەر سابات و لەژێر پەردەی ساباتەکە، لەسەر ئەو کورسییە دانیشتم کە ڕۆژێک لەسەر ئەو ڕازی دڵمان دەربڕیبوو و ڕۆحمان پێکەوە گرێ دابوو. خۆر بە تەواوی ئاوا بووبوو و هەوا خەریک بوو تاریک دادەهات. هەورێکی بەهاری، ڕەش و سووک، باڵی بەسەر ماڵ و باخەکەدا کێشا بوو. لە نێوان ساقەتەی ئەستووری دارەکانەوە سنووری نێوان ئاسمان و زەوی لە شۆقی ڕووی بە تاریکیی ئێوارەدا بە ڕوونی دەبیندرا و ئەستێرەیەکی چکۆڵە سریوەی کزی خۆی دەست پێکردبوو. لە سەرووی هەموویانەوە هەورێکی سووک پەلی هەڵخستبوو و هەموو شتێک گوزارشتی لە بارانی داهاتوو دەکرد. بایەکەی خستبوو و گەڵایەک و تەنانەت لقە گیایەک نەدەجووڵایەوە. بەرامەی یاسی بنەوش و چرۆی بڵاڵووکە کێویلە فەزای باخ و ساباتەکەی داگرتبوو، وەهاشی داگرتبوو کە دەتگوت هەوا سەرتاسەری بۆتە گوڵستان و بۆن و بەرامەکەی هێندێ جار کز و هێندێ جاریش هەناسەکێشی مەست دەکرد. پیاو حەزی دەکرد چاوی بقووچێنێ و هیچ نەبینێ و تەنیا ئەو بۆن و بەرامە دڵگر و شیرینە پڕ بە سییەکانی هەڵمژێ. بنجی هێشتا گوڵ نەکردووی کەوکەو و گوڵەباخ لەسەر خاکی تۆخ و تازە تەکمیش کراوی باخچەکە بەبێ جووڵە ڕیزیان بەستبوو و دەتگوت دەیانهەوێ لە لاجامەی سپی و تازە داتاشراوی دەوری خۆیان بە زۆر وەسەر بکەون. بۆقەکان گەرمیان کردبوو ئاوازیان بۆ یەکتر دەساندەوە و بەر لەوەی باران بەسەر هەسێڵەکەیاندا بباریێ جەخاری دڵیان بە قیرەقیرِی گوێ ئازاردەر بەرەو ئاسمان دەنارد. بولبولەکان بە نۆرە دەیانخوێند و لەم چل بۆ ئەو چڵ دەفڕین و فڕەفڕی باڵیان دەهات. لەم بەهارەدا دیسان بولبولێک هەوڵی دەدا لە نێو بنجە گوڵێکی بن پەنجەرەکەدا جێ خۆش بکات و کاتێک من هاتم بۆ بەر ساباتەکە ترسا و هەڵفڕی، چوو لە پشت دارەکانی قەراغ ڕێگاکە نیشتەوە و چریکەی خوێندنی وەک هۆنراوەیەکی مرواری لە گەرووی دایە دەرێ و لە چاوەڕوانی وەڵامدا بێدەنگ بوو.

منیش هەوڵم دەدا ئاسوودەیی بە دەست بهێنم و چاوەڕوان و هیوادار بووم کە ڕووداوێک ڕووبدات.

مێردەکەم لە قاتی سەرێ هاتە خوارێ و لە پەنامدا دانیشت.

گوتی: «سەرتاپایان دەخووسێ هەتا دەگەنەوە.»

گوتم: «بەڵێ!» ئیتر هەردووکمان بێدەنگ بووین.

سریوەی با نەدەهات و خێوەتی هەوری ڕەش جار لەگەڵ جار نەوی دەبۆوە و هەموو شتێک بەردەوام بێدەنگتر و پڕ بەرامەتر و بێ جووڵەتر دەبوون. لەپڕ دڵۆپێکی گەورە داوەری و کەوتە سەر خێوەتی ساباتەکە و دڵۆپێکی تر کەوتە سەر ڕێگا خیزڕێژ کراوەکە و دوای ئەو پەیتا پەیتا دڵۆپەکان بەسەر بنجی پڕ گەڵای گیاهەوێداردا بارین. بە دوای ئەویشدا ڕێژنەیەکی ساردی گۆپاڵە باران سەربان و ڕێگاوبانی خووساند و پلووسک و لووساوکانی خستە کار. بولبولەکان و بۆقەکان بە تەواوی بێدەنگ بوون و جگە لە خرمەخرمی نەرمی باران هیچ دەنگێکی تر نەدەبیستراو و بە هۆی شێدار بوونی هەواوە دەتگوت دەنگەکە زۆر لە دوورەوە دێ. چۆلەکەیەک کە لە نێو لکی وشکەڵی دارەکانی نزیک ساباتەکەدا خۆی حەشاردابوو جریوەی خۆی بە دوو نۆتەی یەکسان پەیتا پەیتا بەرەو ئاسمان دەنارد.

لەگەڵ ئەوەی هەوڵم دەدا ڕایگرم گوتم: «بۆ کوێ دەچی؟ ئێرە بەو خۆشییە، بۆ لێرە نامێنیتەوە؟...»

گوتی: «دەبێ چەتر و جزمەیان بۆ بنێرم.»

ـ«گوێیان مەدەیە! بایی زەحمەتەکەی نابێ. ڕێژنەیەکە زوو خۆشی دەکاتەوە!»

مێردەکەم بە نیشانەی قەبووڵ کردن سەری لەقاند و لەپاڵ لاجامەکەدا دانیشتین. من قۆڵم نایە سەر لێواری تەڕ و لووسی لاجامەکە و سەرم بەرەو ئاسمان بەرز کردەوە. بارانی فێنک بەشێک لە قژ و لاملمی تەڕ کرد. هەور باڵی بەسەردا کێشابووین و جار لەگەڵ جار پرژوبڵاو دەبوونەوە و ئاسمان ڕوون دەبۆوە. خرمەخرمی ڕێژنە جێی خۆی دا بە ترپەترپی دڵۆپەی دانەدانە کە لە ئاسمانەوە بەسەر لک و گەڵای دارەکاندا دەتکان. قیرەقیری بۆقەکان دیسان لە خوار ڕێگاکەوە دەستی پێکرد و بولبولەکان لە هێلانە و پەنا و پەسیو هاتنە دەرێ و

چریکەیان لە پەڕاوپەڕی باخەکەدا دەنگی دایەوە. لە نێو دەوەن و بنجی چڕوپڕی گیا و گوڵەکاندا کە گەڵا و لقەکانیان ئاوی لێ دەتکا، هەر جاری لە لایەکەوە دەیانخوێند و بانگی یەکترییان دەکرد. لەبەر چاوی ئێمە هەموو شتێک ڕووناک بوو.

ئەو لەسەر لاجامەکە دانیشت و دەستی بە قژە تەڕەکەمدا هێنا و گوتی: «بەزیاد بێ بە ڕاستی هەوایەکی خۆشە و کەیفی لەلایە!»

ئەو دەست بەسەردا هێنان و لاواندنەوەیەی زیاتر وەک لۆمە دەچوو. حەزم دەکرد دەست بکەم بە گریان.

دیسان گوتی: «پیاو ئیتر چیی دەوێ؟ من ئێستا هێندە دڵخۆشم کە هیچ شتێکی دیکەم لە خودا ناوێ. بەختەوەریش لەوە زیاتر هەر نابێ.»

لە دڵی خۆمدا گوتم: «ئەو کاتانە جۆرێکی تر قسەت دەکرد! دەتگوت هەر چەندەش بەختەوەر بی هەمیشە شتێکی دیکەت دەوێ و دڵت بۆی دەکورکێنێ، بەڵام ئێستا تۆ ئارامی و لە هەموو بارێکەوە ڕازیی، کەچی ئێستا من هەستی پەشیمانییەک لەسەر ڕۆحم قوورسایی دەکات: ئەو داخ و حەسرەتی پەشیمانییەی لە ناخمدا پەنگی خواردۆتەوە، بۆتە بارێکی قورس و بە ددان پێدانانێک لەسەر دڵم سووک نابێ!»

گوتم: «زۆر دڵخۆشم کە تۆ ئەوەندە دڵشادی و هەموو شتێک لەبەر چاوت ئەوەندە جوانە وخەمیشم هی ئەوەیە کە هەموو شتێک لە دەرەوەی من جوان و دڵبزوێنە بەڵام لە ناخمدا هەموو شتێک دڵتەزێن و ناساز و ناقیسە. هیچ شتێک کامڵ نییە و هەر شتەی شتێکی کەمە. یانی ڕەنگە تۆ هیچ خەمێکت نەبێ و بۆ وێنە داخ و مخافەتێکی ڕابردوو مەیلت بۆ بەهرەمەند بوون لە سروشت ڕمووده نەکات؟»

ئەو کە خەریکی لاواندنەوەم بوو دەستی لەسەر قژم لابرد و تۆزێ بێدەنگ بوو، پاشان بە لەبزێک کە دەتگوت هەوڵ دەدات شتێکی ڕابردوو وەبیر خۆی بهێنێتەوە گوتی: «لە ڕابردوودا، بە تایبەت لە بەهاردا بۆ منیش پێش هات. منیش شەوانە بەخەبەر دەمامەوە و بە هیوای هاودڵی و دۆستایەتی کە ئەم هاودڵی و دۆستایەتییە زۆر هاودەمی چاک بوون!... بەڵام ئەو کاتە ژیانم لەبەر دەمدا بوو

و ئەمڕۆ هەموو شتێکم ناوەتە پشت سەرم و لە دەستم دەرچووە. بەڵام ڕازیم و هەر ئەوەشم بەسە!» ئەم ڕستەیەی دوایشی بە دڵنیاییەکی هێندە زۆرەوە دەربڕی کە ئەگەرچی بیستنی ژانی بە دڵمدا دەهێنا بەڵام پێموابوو ڕاست دەکات.
پرسیم: «ئیتر چ ئارەزوویەکت هەیە؟»
لە هەستەکەی من تێگەیشت و گوتی: «هیچ، من شتی مەحاڵم ناوێ.» دەستی بە پرچەکانمدا هێنا وەک ئەوەی منداڵێک بلاوێنێ درێژەی بە قسەکانیدا: «تۆ حەز دەکەی سەرت تەڕ بێ، ئێرەیی بە گیاوگژ و گەڵاکان دەبەی کە باران خووساندوونی. تۆ حەز دەکەی گەڵا و گژوگیا بی و باران بتخووسێنێ، هەروەها ببیتە بارانیش و بەسەریاندا بباریێ. من هەر بەو هۆیە ڕازیم لە گەڵاکان و گژوگیا و باران وەک هەموو شتە جوان و نەشە بەخش و دڵبزوێنەکانی دنیا بڕوانم و ئۆخژن و شادی دڵم دابگرێ.»
بە دڵێکی کەلاوڕێژ لە خەم و ئازارەوە پرسیم: «ئاخ بۆ هیچ شتێکی ڕابردووش هەڵناکێشێ کە لە دەستت دەرچووبێ؟»
دیسان چوو لە دەریای بیر و خەیاڵەوە و ماوەیەک بێدەنگ بوو. دیتم دەیهەوێ زۆر ڕاستوێژانە وەڵامم بداتەوە.
سەری هەڵێنا و تەنیا گوتی: «نا!»
ڕووم وەرگێڕا و چاوم لە چاوی بڕی و گوتم: «نا، ئەوە ڕاست نییە. نابێ ڕاست بێ. مەگین دەبێ ئاخ بۆ ڕابردوو هەڵنەکێشی؟»
دیسان دووپاتی کردەوە: «نا، من زۆر لە ڕابردوو ڕازیم و شوکری خودا دەکەم و قەت بۆی بە داخەوە نیم.»
گوتم: «تۆ حەز ناکەی بگەڕێینەوە بۆ ڕابردوو و ئەوەی کە هەمانبوو؟»
ڕووی لە من وەرگێڕا و لەگەڵ سەیر کردنی باخەکە گوتی: «ئەمە وەک ئەوە وایە باڵم لێ بڕوێ و هەڵفڕم. شتی وا ناگونجێ!»
ـ«ئەی ناتەوێ هەڵەکانی ڕابردوو ڕاست بکەیەوە؟ یانی بە هۆی ئاکاری ڕابردووتەوە خۆت سەرکۆنە ناکەی؟ لۆمەی منیش ناکەی؟»
ـ«قەت! باشتر لەوەی گوزەرا ناگونجێ و مەحاڵیشە.»

دەستم لەسەر دەستی دانا تاکوو سەری وەرسووڕێنێ و چاو لە من بکات، گوتم: «گوێ بگرە بزانم! بۆچی قەت پێت نەگوتم کە حەز دەکەی ئەو جۆرە بژیم و هەڵسوکەوت بکەم کە بە دڵتە؟ بۆچی ئازادت کردم؟ لە حاڵێکدا من نەمدەتوانی کەڵک لەو ئازادییە وەرگرم؟ بۆچی ڕێنوێنیت نەکردم؟ ئەگەر بتویستبایە، بتخستبایەمە سەر ڕێگایەکی باش و دروست ئەم بارودۆخە پێش نەدەهات! قەت ئاوای لێ نەدەهات!» گلە و بناشتێکی بەردەوام بە قسەکانمەوە دیار بوو. ڕقێک لە دەنگمدا قووڵپی دەدا و هیچ شوێنەوارێکی لە ئەشقی ڕابردوو پێوە دیار نەبوو.

بە سەرسووڕمانەوە ڕووی تێکردم و پرسیی: «مەبەستت چییە؟ "چۆن" ئاوای لێ نەدەهات؟ ئەوەی بوو هەمووی باش بوو.» بە پێکەنینەوە دووپاتیشی کردەوە: «بەڵێ، زۆر باش بووا!»

بە چاوی فرمێسک تێزاوەوە لە دڵی خۆمدا گوتم: «یانی بە ڕاستی تێ ناگات؟ یان لەوە خراپتر نایەوێ تێ بگات؟»

لە ناکاو دەنگم هەڵبڕی: «دەپرسی چی بووە؟ ئەوەیە کە من دەرهەق بە تۆ تووشی تاوانێک نەبووم بەڵام تۆ بە سەرساردی و کەمتەرخەمیت و تەنانەت بە سووکایەتی خەریکی سزام دەدەی ئاوا بووە کە من بێ تاوانم و تۆش ئەوەی بە لامەوە خۆشەویست بوو لێت زەوت کردم!»

لەگەڵ ئەوەی وای دەنواند کە لێم تێدەگات گوتی: «تۆ دەڵێی چی، خۆشەویستەکەم؟»

ـ«نا، لێم گەڕێ با کوڵوکۆی دڵم هەڵڕێژم... تۆ ئیتر متمانەم پێ ناکەی، ئەشقی ڕابردووت لە من ساندۆتەوە و تەنانەت بە شیاوی ڕێزیشم نازانی. چونکە من، کاتێک بیر لە ڕابردوو، یانی سەرەتای هاوسەرگێریمان دەکەمەوە و ئێستا لە پاڵ ڕابردوودا دادەنێم ناتوانم بڕوا بکەم کە خۆشت دەوێم. نا، قسە مەکە. من دەمەوێ ئەوەی ساڵانێکە لەسەر دڵم بۆتە وەرهەم و ئازارم دەدات، هەڵیڕێژم. تاوانی من بوو کە لە ژیان بێ ئاگابووم و تۆش هەروا وێڵت کردم و ڕێگات نەخستە بەرپێم تاکوو خۆم بیچمی کرێت و دزێوی ژیا بدۆزمەوە؟... ئێستا تاوانی منە کە ئەوەی دەبێ بیناسم بە تەنیا ناسیومە و نزیکەی ساڵێکە بە چنگ و ددان بەربەرەکانێ دەکەم کە بگەڕێمەوە بۆلات و تۆ بەردەوام لە خۆتت

**دەتاراندم و وات دەنواند کە تێ ناگەی چیم دەوێ؟ ئێستا ڕەفتارت وای لێهاتووە کە تەنانەت ناکرێ سەرکۆنەشت بکەم و لەو نێوەدا منم کە هەم تاوانبارم و هەم چارەڕەش. بەڵێ، تۆ دەتەوێ دیسان بمخەیتە سەر ڕێگایەک کە داو و تەڵەیە بۆم و شتێکی وای نەماوە کارەساتێکی ڕەش بەسەر من و تۆدا بێنێ.»**

**بە واقوڕمان و نیگەرانییەوە سادقانە گوتی: «چۆن؟ تۆ چۆن بەو ئاکامە گەیشتی؟»**

**ـ«تۆ نەبوو هەردوێنێ دەتگوت و بەردەوام دووپاتت دەکردەوە، کە من بەم ژیانەی ئێرە ڕانایەم و دەبێ بڕۆم و دیسان دەبێ سێ مانگەی زستان لەو پترزبۆرگە بەقوڕێ گێراوە ڕایبوێرین کە لێی بێزارم؟ بە جێی ئەوەی دەستم بگری و یارمەتیم بدەی، لە یەکدڵی وەڕەزی و لێی ڕادەکەی و خۆشەویستیی ڕابردووت لە بیر بردۆتەوە. ئاخری دەزانم ئەو کاتەی بە یەکجاری دەڕووخێم تۆ دڵخۆش دەبی و دەست دەکەی بە سەرکۆنە کردنم کە ڕێم لێ هەتڵە بووە.»**

**بە ڕاوێژێکی ڕەق و ساردوسڕ گوتی: «بەسیکە! ئەو قسانەی دەیکەی هیچی دروست نییە. تۆ هەقت نییە ئەو قسانە بکەی! ئەو قسانە نیشاندەری نیاز خراپیی تۆیە. دەری دەخات کە...»**

**ـ«کە تۆم خۆش ناوێ؟ بیڵێ دەی دە بیڵێ...» ئەوەم گوت و فرمێسکم هاتە خوارێ، لەسەر کورسییەکە دانیشتم و دەسرەیەکم بە بەر دەموچاومەوە گرت.**

**هەوڵم دا پێش بەو فرمێسکانە بگرم کە لە ناخم هەڵدەقووڵان و لە دڵی خۆمدا گوتم: «ئەو ئاوا لە حاڵی من تێگەیشتبوو؟ دەنگێک لە ناخمدا گوتی"ئەشقی ڕابردووی ئێمە کۆتایی پێ هاتووە و بە یەکجاری تەواو بووە!"» لێم نزیک نەبۆوە و هەوڵی نەدا دڵخۆشیم بداتەوە. ئەو قسانەی بە ئەوم گوتبوو زویری کردبوو. دەنگی ئارام و ساردوسڕ بوو.**

**گوتی: «تێناگەم هۆی ناڕازی بوونت لە من چییە؟ ئەگەر مەبەستت ئەوەیە کە وەکوو ڕابردوو خۆشم ناوێی...»**

**من هەروا دەسرەکەم بە بەرچاومەوە گرتبوو گوتم: «دیتووتە؟ خۆت گوتت ڕابردوو...» فرمێسکم بە خوڕتر لە چاوم هەڵقوڵا.**

ـ«باشە، ئەوە خەتای تێپەڕینی زەمانە و خەتای خۆشمان، چونکە پیربووین. هەر تەمەنەی ئەشقێکی تایبەت بە خۆی هەیە...» گتێکی گرت. پاشان گوتی: «ئێستا چاوەڕوانی ئەوەی ڕاست و ڕەوان بم لەگەڵت، با ڕاستییەکەیت پێ بڵێم. ئەو ساڵەی کە تازە تۆم ناسیبوو شەوانە خەو نەدەچووە چاوم و بیرم لە تۆ دەکردەوە و ئەشقی تۆم لە دڵمدا پەروەردە دەکرد و نەمامی ئەو ئەشقە بەردەوام گەشەی دەکرد. هەروەها دواتر لە پترزبۆرگ و بادێن، کە بۆ ئاودەرمانی چووبووین، شەوانە هەتا بەیانی نەدەخەوتم بە پێچەوانەی ئەو ڕۆژانە، بینای ئەو ئەشقەم دەڕووخاند کە مایەی ئازارم بوو. بەڵام بە تەواوی خاپوورم نەکرد. ئەو شتەم لێ دوور خستەوە کە ئازاری دەدام. بەو شێوەیە ئاسوودەیی و ئۆقرەم بە دەست هێنایەوە و هێشتا تۆم خۆش دەوێ. گریمان بە شێوەیەکی تر.»

گوتم: «تۆ ئەوە بە ئەشق دەزانی، بەڵام بۆ من ئازار و ئەشکەنجەیە. ئەگەر هەستان و دانیشتن لەگەڵ خەڵکی بە بڕوای تۆ ئەوەندە کارێکی دزێو و نەشیاوە و دەبێتە هۆی کاڵ بوونەوەی ڕەنگی ئەشقت، بۆچی هێشتت من بچمە نێو ئەو خەڵکەوە؟»

ـ«ئەوە پێوەندیی بە خەڵکەوە نییە خۆشەویستەکەم!»

ـ«بۆچی ئەو وزەیەی هەتبوو بە کارت نەهێنا؟ بۆچی دەست و لاقت نەبەستم و لە بەندت نەکردم؟ بۆچی لێت نەدام؟ ئەگەر ئەو کارانەت بکردایە من ئێستا بەختەوەرتر دەبووم. دڵخۆش بووم و هەستم بە شەرمەزاری نەدەکرد؛ بەڵام ئێستا ئەوەی دەبووە هۆی بەختەوەریم بە تەواوی دۆڕاندوومەوە و لە دەستم دەرچووە.»

دیسان کانیی فرمێسکەکانم تەقینەوە و بە هەردوو لەپی دەستم دەموچاوم داپۆشی.

لەو کاتەدا سۆنیا و کاتیا بە سەرتاپای خووساوەوە بەڵام دەم بە پێکەنین هاتنەوە و خۆیان کرد بەژێر ساباتەکەدا. پێدەکەنین و بە دەنگی بەرز قسەیان دەکرد. بەڵام کە چاویان بە ئێمە کەوت بێدەنگ بوون و خۆیان کرد بە ژووورێدا و ئێمەیان بەجێ هێشت.

که ئەوان ڕۆیشتن ئێمە ماوەیەک متەقمان نەکرد. ئەوەی فرمێسکم هەبوو هەڵم وەراند و کوڵوکۆی دڵم هەڵڕشت. سەرم هەڵێنا و چاوم لە ڕوخساری کرد. سەری کردبووە سەر لەپی دەستی و دانیشتبوو و دەیویست لە وەڵاممدا شتێک بڵێ، بەڵام تەنیا هەناسەیەکی هەڵکێشا و هەروا سەری لەسەر لەپی دەستی دانابوو.»

من لێی نزیک بوومەوە و دەستیم لە ژێر ڕوومەتی دەرهێنا و بە دەستمەوە گرت. نیگای ئاڵۆز و خەمباری لەسەر دەموچاوم گێرسایەوە.

بە جۆرێک کە دەتگوت بە بیر و خەیاڵەکانیدا دێتەوە گوتی: «بەڵێ، ئێمە هەموومان بە تایبەت ئێوە ژنان دەبێ لە هەموو کەندولەندە دزێو و بێ ماناکانەی ژیان تێپەڕین تاکوو بگەینە بنەمای پاقژی ئەو. هیچ کەس باوەڕ بە ئەزموونەکانی تر ناکات و وەری ناگرێت. زۆری مابوو تۆ لە دەریای شێتی و یاریی منداڵانەی ژیان بێیتە دەرێ کە من بەرەو ڕوو بوونەوەت لەگەڵ ئەوان بە کارێکی باش دەزانم و هانت دەدەم. بۆیەش ئازادم کردی و لێت گەڕام ئاسوودە بی، تاکوو خۆت هەموو شتێک بئەزمووی و قەیرانی تافی لاویت تێپەڕێنی و هەستم دەکرد هەقم نییە بتخەمە تەنگەژەوە، ئەگەرچی بۆ من تافی لاوی لەمێژ بوو کۆتایی پێ هاتبوو.»

گوتم: «بۆ ئاوا کاتی خۆتت بە فیڕۆ دا و ئەگەر خۆشت دەویستم بۆچی هێشتت من بەو شێوەیە تەمەنی لاویم بە فیڕۆ بڕوات؟»

ـ«چونکە ئەگەر بشتویستبایە نەتدەتوانی بڕوا بە قسەکانی من بکەی. دەبوو خۆت ئەو ڕێگایە ببڕی و ئێستاش بە تەواوی تاقیت کردۆتەوە!»

گوتم: «هەمووی هەر بەڵگە هێنانەوە! لە ڕادەبەدەر بەڵگەت دەهێنایەوە و بەو جۆرەی پێویست بوو خۆشت نەویستم!»

دیسان بێدەنگ بووین.

لە ناکاو هەستا و لەژێر ساباتەکە دەستی کرد بە هاتووچۆ و گوتی: «ئەو قسەیەی کردت زۆر دڵڕەقانەیە، بەڵام هەقت پێدەدەم.» بەرەو ڕووی من ڕاوەستا و گوتیشی: «بەڵێ، هەقت پێ دەدەم تاوانی من بوو. من یان دەبوو ئیجازەی خۆشەویستیتم بە خۆم نەدایە، یان سادە و ساکارتر خۆشم ویستبایەی.»

بە شەرمەزارییەوە گوتم: «وەرە با هەموو شتێک لە بیر بەرینەوە.»

ـ«نا، ئەوەی تێپەڕیوە ناگەڕێتەوە. تۆ قەت ناتوانی. ئەوەی لە دەست دەرچووە تازە ناگەڕێتەوە...» کاتێک ئەو قسەیەی دەکرد ڕاوێژی زۆر نەرم و لەسەرەخۆ بوو.

دەستم نایە سەرشانی و گوتم: «بۆ ئێستا هەموو شتێک هاتۆتەوە جێی خۆی؟» دەستی گرتم و گوتیشی: «ئەوەی گوتم "بۆ ڕابردوو بە داخ نیم" درۆ بوو. داخی ڕابردوو لەسەر دڵم قوورسایی دەکا. خەمی ئەشقێک کە ئیتر بوونی نییە و ئیتر ناشبێتەوە بە ڕاستی دڵتەزێنە. تاوانی ئەو زەواڵە کێیە؟ نازانم. ئەوینەکە ماوە بەڵام ئەوە نییە کە بوو. جێگاکەی ماوە بەڵام زۆر کەمڕەنگە. ئیتر وزە و هەوێنی ڕابردووی پێوە نییە. بیرەوەرییەک ماوەتەوە و قەدرزانین، بەڵام...»

قسەکەم پێ بڕی: «نا، شتی وا مەڵێ... لێگەڕێ با هەموو شتێک وەک ڕابردووی لێبێتەوە.» چاوم لە چاوی بڕی و گوتم: «جا دەگونجێ؟ پێم بڵێ بزانم دەگونجێ؟» بەڵام چاوەکانی ڕوون و ئارام بوون و سەرنجی لە قووڵایی چاوەکانمدا مەلەی دەکرد.

لەگەڵ ئەوەی ئەم قسانەم دەکرد لە پێشدا هەستم کرد کە ئاواتەکەم نایەتە دی و ئەوەی لە ئەوم دەوێ مەحاڵە. بزەیەکی هاتێ کە لێوڕێژ بوو لە سەفا و شیرینی، بەڵام لەبەر چاوم بزەی پیرە پیاوێک بوو.

گوتی: «تۆ چەندە گەنجی و من چەندە پیرم! ئەوەی لە دڵی مندا لێی دەگەڕێی ئیتر بوونی نییە.» هەر بەو بزەیەوە گوتیشی: «بۆچی لە خۆڕا خۆمان هەڵخەڵەتێنین؟» بێ ئەوەی قسەیەک بکەم لە تەنیشتی ڕاوەستام. لە دڵمدا هەستم بە ئۆخژن و هێمنایەتییەکی زیاتر کرد.

درێژەی بە قسەکانی دا: «با هەوڵ نەدەین درێژە بە ژیانی ڕابردوو بدەین. بۆ درۆ لەگەڵ خۆمان بکەین؟ ئێستا کە ترس و سەرلێشێواوی و چەواشە بوونەکانی ڕابردوو لەنێو چوون، دەبێ شوکری خودا بکەین. هیچ هۆیەک نییە کە خۆمان بخەینە ئازارەوە. بە ڕادەی پێویست بەختەوەریمان بە نەسیب بووە.» ئاماژەی بە دایەن کرد کە ڤانیای بە باوەشەوە بوو، هاتبووە خوارێ و لەبەر دەرگانەی ساباتەکە ڕاوەستا بوو، درێژەی پێدا: «ئێستا دەبێ خۆمان بکێشینە دواوە و جێگای خۆمان بدەین بە منداڵەکانمان. سەری منی برد بۆ لای سینگی و

**نێوچاوانی ماچ کردم و گوتی: «ئەم ماچە ئیتر ماچی دڵدۆڕاوێک نییە. ماچی هاوڕێیەکی وەفادارە.»**

**لەو کاتەدا شنەی نەرم و پڕ بەرامەی شەوبا لەلای باخەکەوە دەهات جار لەگەڵ جار دەنگ و خوێندنەکان و هەروەها بێدەنگیی شەو خۆش و پڕشکۆتر دەبوو، ئاسمان چرای زیاتری دادەگیرساند. من چاوم لە ئەو دەکرد و لە ناکاو هەستم کرد ئاسوودەتر بووم و هێمنایەتی باڵی بەسەر دڵمدا کێشاوە. دەتگوت ئێسکێکی ملۆزمیان لە نێو برینی جەستەم دەرکێشاوە. لە ناکاو بەڕوونی و ئارامی بۆم دەرکەوت کە ئەو هەستەی لە ڕابردوودا لە دڵمدا بوو وەک دەورانی ڕابردوو وایە و ئیتر گەڕانەوەی بۆ نییە، هەوڵدان بۆ گەڕاندنەوەشی نەک بێ ئاکامە، بەڵکوو زۆر پڕئازاریشە. بەڵام ئێستا بابزانین ئەم دەورانەی کە لەبەر چاوی من تا ئەو ڕادەیە پڕ بەختەوەری بوو بە ڕاستی ئاوا شیرین بوو؟ ئاخ ئەو دەورانە چەندە دوور بوو لەبەر چاوم، چەندە دوور!**

**گوتی: «کاتی ئەوەیە چایی بخۆینەوە.»**

**هەستاین و چووین بۆ هۆڵەکە. لەبەر دەرگانەی هۆڵەکە تووشی دایەن بووم کە ڤانیای بە باوەشەوە بوو. کۆرپەکەم لێ وەرگرت و لاقە سوور و وردەکانی کە وەدەر کەوتبوو داپۆشینەوە. توند لە باوەشم گرت و مۆری ماچێکی ناسک و ئارامم بە ڕوومەتییەوە نا. دەستە چکۆڵەکەی بە قامکی چرچولۆچەوە دەتگوت لە خەودا ڕایاندەتەکێنێ، هەروەها چاوەکانی هەڵێنا، بەجۆرێک کە دەتگوت لە شتێک دەگەڕێ و هەوڵ دەدا شتێکی وەبیر بێتەوە؛ لە ناکاو ئەو چاوە چکۆلانانە لەسەر ڕوخسارم گیرسانەوە، چەقیان بەست و تروووسکەی نیگا لە نێویاندا درەوشایەوە. لێوە چکۆڵە و ناسکەکانی لەسەر یەک دانا و بە شیلەبزەیەک دیسان لێک کرانەوە. ئەوم بە سینگمەوە گوشی و مۆچڕکێکی شیرین بە سەرتاپای لەشمدا مێروولەی کرد. بەجۆرێک کە هەوڵم دا لەوە زیاتری بە خۆمەوە نەگوشم چونکە لەوانە بوو ئازاری پێ بگات، لەدڵی خۆمدا گوتم: «ئەمە ڕۆڵەی منە، جگەرگۆشەمە!» پاشان لاقە وردیلەکانی و دەستە ناسکەکانی و سەرە چکۆڵە توکنەکەیم ماچ باران کرد. مێردەکەم هات بۆلام. خێرا ڕوخساری منداڵەکەم داپۆشی و دیسان ڕووپۆشەکەم لەسەر لادایەوە.**

مێردەکەم قامکی بەژێر چەنەی ڤانیادا هێنا و گوتی: «ئیڤان سێرگی ئیچ»[٢٠] بەڵام زوو دەموچاوی ئیڤان سێرگی ئیچم داپۆشییەوە. جگە لە من هیچ کەس مافی ئەوەی نەبوو ماوەیەکی زۆر چاو لە دەموچاوی ببڕێ. چاوێکم لە مێردەکەم کرد. ئەویش چاوی لە من بڕی و پێدەکەنی، دوای ماوەیەکی زۆر بۆ یەکەم جار، بە شادی و نەشەوە نیگام ئاوێتەی نیگای کرد.

لەو ڕۆژە بە دواوە باری ئەویندارانەی ژنومێردایەتیمان کۆتایی پێهات و هەستی کۆن و ئاشقانەی پێوەندیمان وەک بیرەوەرییەکی شیرینی لێ هات کە ڕیشەکەی ماوەیەکی زۆر بوو بۆ هەمیشە ویشک بووبوو و هەستی خۆشەویستییەکی تازە و قورس و قایم سەبارەت بە دوو منداڵەکەم و باوکی ئەوان بوو بە بناغەی ژیانێکی نوێ و بەختەوەرانە کە چێژ و شیرینییەکەی هەتا ئەم ساتە هێشتا کەم نەبۆتەوە.

## فەرهەنگۆک

ئاخێزگە: سەرچاوە، ژێدەر.
ئاڤزێڵ: هەسێڵ، ئەستێر، گۆلاوی بەرکانی (استخر)
بووکەڵە: بووکۆکە، بووکەباخەی منداڵان.

---

[٢٠] ڤانیا سووکەڵە ناوی ئیڤانە و سێرگی ئیچ یانی"کوڕی سێرگی ئیچ و ئەوە شێوەیەک بانگ کردنە بە ڕێزەوە.

بابەخێو: پیاوێک کە سەرپەرشتیی منداڵێکی بێکەس دەگرێتە ئەستۆ. (پدر خوانده)

بادەوە: بارینی بەفر بە باوەوە و گێژ و خول دانی. (کولاک)

بایەڵان: دەستباد، دەست بڵاو، هەڵەخەرج.

پزیسک: وردە پریشکەی ئاگر.

پەرجۆ: مۆجزە(معجزه)

پۆڵاکورۆژ: بریتی لە مرۆڤی ئازا و بەجەرگ و خاوەن وزە و توانا.

تەڤز: تەوس، تانە، تەشەر.

جانجرووک:بریتی لە منداڵی گڕەزۆک و هاروهاج.

جانکوش: مجێوری کلیسا، خزمەتکاری کەنیسە.

جگ: دوگمەی کیبۆرد و پانۆ و تەختەکلیل و...

چپڕ: دارستانی پڕ دارو دەوەن، چڕوپڕ.

چەقچەقە: گیایەکی گوڵ شینە لەنێو گەنمدا دەروێ و بو دەرمان دەبێ. (افسنتین)

چەکچەکی: شەمشەمەکوێرە، پارچک.

خۆیان: کلۆشی گێرەکراو و کۆگاکراوی سەر خەرمان کە ئامادە کرابێ بۆ شەن کردن.

خووسار: سیخوار، خویز، خووس.

دایەخێو: ژنێک کە سەرپەرشتیی منداڵێکی بێکەس دەگرێتە ئەستۆ. (مادر خوانده)

دڵەدوا: نیگەران و دڵ نەحەساوە. ( دلواپس)

دووحاچە: دووفلیقانە، دوولک.

دێمۆدە: بێ نرخ، ناحەز و بێ بایەخ. (مبتذل)

ڕشقنجاڕ: گاڵتەجاڕ، کەسێک کە دەبێتەگاڵتەی دەستی هەمووان و پێی پێدەکەنن.

ڕیقناسە: لوولەی سەرەکیی سیپەلک. (نای)

سۆڵانەوە: کزانەوەی برین، کزەکز. (سوزش)

سەرانشۆ: تەرکردنی سەری منداڵی تازە لەدایک بوو بە ئاوی پیرۆز لە لایەن قەشەوە. (غسل تعمید)

سیکلدانۆچکە: ئەو کونە لوولەییانەی بە سیپەلاکەوەیە.

ڤارگۆن: ڤاگۆن، (واگن)
قەویت: سەرپەرستی خێزانی مردوو، (کفیل)
قولەقاپە:گوێزنگ، قولاپە.
کاشە: خێشکی سەر بەفر و سەهۆڵ کە سەگ و ئەسپ ڕایدەکێشن. (سورتمە)
کاشەوان: لێخوڕی کاشە، (سورچی)
کرێت: دزێو، ناحەز.
کلومنجر: لاجەولاج، شەفتوول، (اریب)
کۆدە: زەویی شێو بڕاوی دانەچێندراو.
کوڕیژگە: مێرمنداڵ.
کەترەخەم: کەمتەرخەم، بێ موبالات، سەرسارد.
گرژینەوە: زەردە گرتن، بزە نیشتنە سەر لێو.
گەلحۆ: گەمشۆ، گەوج، حەپۆل، هەقمەق.
گیا هەوێدار: گیایەکی گەڵا پانەبۆ دەرمان دەشێ. (گیاه بابا آدم)
مووقەڵێش: بریتی زۆر وردبین. (موشکاف)
مخافەت: داخ و خەفەت، جەخار، کەسەر.
ناوە: سنووری نێوان دوو کێڵگە.
نەتەوی: نەیار، دژ، دوژمن.
هۆڤ: کێوی، دڕندە، وەحشی.
هەساو: ساو، ئاسمانی بێ هەور، ساماڵ.
هەسێڵ: ئاڤزێڵ، ئەستێر، گۆلاوی بەرکانی (استخر)
هەنتەش: حوزوور، لەبەر دەم.
هێلوون: قووڵکی چاو، چاڵی چاو.
یەکهاوی: لە سەریەک و بە دوای یەکدا. (یکنواخت)

**بەرهەمە چاپکراوەکانی وەرگێڕ:**

**١) تاپۆی وەرزێکی سەوز ـ کۆمەڵەشیعر ـ ١٩٩٧**

**٢) شەوەژانی ئەستێرەیەک ـ کۆمەڵەشیعر ـ ٢٠٠٠**

**٣) مەرگەخەون ـ کۆمەڵەشیعر ـ ٢٠٠٣**

**٤) دیسان لەو شەقامانەوە ـ کۆمەڵە چیرۆکی بیژەنی نەجدی ـ وەرگێڕان ـ ٢٠٠٥**

**٥) تەپڵی ئاور ـ کۆمەڵە چیرۆکی بیانی ـ وەرگێڕان ـ ٢٠٠٥**

**٦) جێگای بەتاڵی سلووچ ـ ڕۆمان ـ مەحموودی دەوڵەتئابادی ـ وەرگێڕان ـ ٢٠٠٦**

٧) خۆر و لاولاو ـ کۆمەڵە شیعری منداڵان ـ ٢٠٠٧

٨) یەکگرتن ـ چیرۆکی منداڵان ـ قودسی قازی نوور ـ وەرگێڕان ـ ٢٠٠٧

٩) برایانی کارامازۆف، ڕۆمان، فیۆدۆر دۆستۆیۆفسکی، وەرگێڕان، ٢٠٠٧

١٠) خولیای نووسین ـ کۆمەڵە وتار ـ ڕەزا بەراهەنی ـ وەرگێڕان.٢٠٠٨

١١ ) فەرهەنگی ڕێژگە ـ (ئەو وشانەی لەهەنبانە بۆرینەدا نەهاتوون) ٢٠٠٩ ١٢) ئەرباب و نۆکەر، ڕۆمان، تۆلستۆی، وەرگێڕان٢٠١١

١٣) باوە سیرگی، ڕۆمان، تۆلستۆی، وەرگێڕان٢٠١١

١٤) دیلی قەفقاز، ڕۆمان، تۆلستۆی، وەرگێڕان٢٠١١

١٥) مەرگی ئیڤان ئیلیچ، ڕۆمان، تۆلستۆی، وەرگێڕان٢٠١١

١٦) دار وپەپوولە و ڕووبار، چیرۆکی منداڵان، فەریدە شەبانفەر ـ وەرگێڕان٢٠١٠

١٧) ئانا کارنینا، ڕۆمان، تۆلستۆی، وەرگێڕان ٢٠١١

١٨) تازیەبارانی بەیەل ـ ڕۆمانی غوڵامحوسێن ساعیدی ـ وەرگێڕان. ٢٠١١

١٩) کەڵەشێری ورگن ـ چیرۆکی منداڵان

**ئەم بەرهەمانەش ئامادەی چاپن:**

١) ئاپۆرەی خەو، کۆمەڵە شێعر

٢) سترانی شەپۆلەکان ـ شێعری هاوچەرخی فارس، وەرگێڕان.

٣) هاوسەگیریی بەختەوەرانە، ڕۆمان، تۆلستۆی، وەرگێڕان.

٤) شارەزاییە بنەڕەتییەکانی ژیان،دورووتی ڕیچ، وەرگێڕان

٥) زایەڵەی شاخ و قیژەی گوڵەباخ، کۆمەڵە شێعر

٦) هاوار و ژیلەمۆ، کۆمەڵە شێعر

٧) نارنجیفڕین، کۆچیرۆک

٨) ڕێگایەک بەرەو هەتاو، کۆچیرۆک، وەرگێڕدران

٩) کازاخەکان، ڕۆمان، لیۆ تۆلستۆی